# فەرهەنگی دەرمانخانەی خێزانی





نووسینی :

د . موحەمەد ڕەزا پاشایی
د . موحەمەد پوور فخرخان
د . سۆران مێهرنیا
مەرزیە نوری ئاق قەڵعی

وەرگێڕانی لە فارسی :
سەبری چاوشین خانۆ



کوردستان - سۆران ٢٠١٤

# فـەرهـەنـگی دەرمانخانەی خـــێزانی

نووسینی:

د: موحەمەد رەزا پاشایی
د: سۆران مێهرنیا
د: موحەمەد پوور فخرخان
مەرزیە نوری ئاق قەلعێ

وەرگێڕانی لە فارسی: سەبری چاوشین خانۆ

پێناسەی کتێب:

ناوی کتێب: فەرهەنگی دەرمانخانەی خێزانی

- بابەت: پزیشکی
- نووسینی: د: موحەمەد رەزا پاشایی

د: سۆران مێهرنیا

د: موحەمەد پوور فخرخان

مەرزیە نوری ئاق قەلعێ

و: سەبری چاوشین خانۆ

- بەرگ: تەیب موعتەسم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- شوێنی چاپ: سۆران
- نرخ: (٤٥٠٠) دینار
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردن: بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٦٥٤ ) ساڵی (٢٠١٣ )ی پێدراوە.

# پێشەکی نووسەران:

لەجیهانی ئەمڕۆ، کە ڕۆژ بەڕۆژ زانستی پزیشکی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوەو دەرمانەکانی ڕووەکی کەوتوونەتە بازاڕ، هەبوونی زانیاری لەبارەی دەرمانەکان مافی هەرخێزانو تاکێکی کۆمەڵگایە، بەڵام بەداخەوە زانیاریەکانی خەڵك لەبارەی تەندروستیو پزیشکی، بەتایبەت دەرمانەکان زۆر کەمە. ئەم پەرتووکەی کە لەبەر دەستتان دایە وەڵامدەرەوەی زۆربەی پرسیارەکانتانە لەبارەی دەرمانەکانو رادەسپێرین کە هەرخێزانێك پەرتووکەکەی لەبەردەست دابێت. لەم پەرتووکەدا هەوڵدراوە ئەو دەرمانانەی کە بەشێوەیەکی باو لەلایەن زۆربەی پزیشکان بۆ نەخۆشەکان دەنووسرێن شی بکرێنەوە، تا خوێنەری ئازیز سەری لێ نەشێوێ.

ئەم پەرتووکە خاوەن ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەیە:

١- زانیاریەکانی گرێدراو بەدەرمانەکانی ژنریکی، کە زۆر بەکاردێن.

٢- زانیاریەکانی تەواوی دەرمانی لە بارەی گرووپی دەرمانی، گرووپی کیمیایی، شێوەی دەرمان، بەکارهێنان، ڕێژەی بەکارهێنان، بەکارنەهێنانو زیانە لاوەکییەکان گرنگو باو، پێداویستیەکانو فێرکردنی نەخۆشو هەلو مەرجی هەڵگرتن.

٣- تێبینیەکانی پەرستیاریو بەکارهێنانی وەکو: ڕاسپاردەکانی پێویست بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی دەرمان، شێوازی ئامادەکردنو بەکارهێنانی لەڕووی سەرهەڵدانی زیانە لاوەکییەکان. پێویستە بوترێ کە بۆ نووسینی ئەم کتێبە لە نوێترین سەرچاوەکانی زانستی تایبەت لە ( CDیەکانی to date up) سوود وەرگیراوەو هەڵگری زانیاری بەنرخو گرنگە، کە بۆ هەرخێزانێك پێویستن.

(نووسەرانی کتێب)

## شێوەی دەرمانەکان:

Ampule (**ئـەمپوول**): دەفرەکـانی شووشـەیین، کـە دەرمانیـان تیـادا هەڵدەگیرێو بەشـێوەی ژێـر پێسـت، لـە پێسـت، ماسـوولکە، دەمـار، دڕکـە مـۆخ، سـکۆلاکانی دڵ، جومگەو ئێسك لێدەدرێتو لە ڕاچێتەی پزیشك بەشێوەی (Amp) دەنووسرێت.

Vial(**ڤیـــال**): دەفرەکـانی شووشــەیی یـان پلاسـتیکین، کـە دەرمـان تیایانـدا هەڵدەگیرێنو لـە (ئـەمپوول) گـەورەترنو بەشـێوەی وەریـدی لێـدەدرێن. لـە ڕاچـێتەی پزیشکان بەشێوەی Vial دەنووسرێت.

Capsule (**کە پسوول**): شـێوەیەك لـە دەرمانـە و ڕەگەزەکـەی ژلاتینـەو کەرسـتەی دەرمانی تێدا هەڵدەگیرێت. لە ڕاچێتەی پزیشکان بە Cab دەنووسرێت.

Tablet (**حەب**): شێوەیەکەی دەرمانـەو پێکهاتەیـەك لـە گێچـی چـێکردنی دەرمـانو ماددەی کارگەرە. لە ڕاچێتەی پزیشکان بەشێوەی Tab دەنووسرێت.

Effervescent. Table: حەبـەکانی بـە کـوڵن (بــە جۆشــن): زیـاتر هەڵــگری ڤیتامینــەکانن، ئـەم حەبانــە لـەکاتی پەیوەنـدی لەگـەڵ ئـاو، گازێـك ئـازاد دەکـەنو دەتوێنەوە، لە ڕاچێتەی پزیشکان بەشێوەی EFF.Tab دەنووسرێت.

Syrup(**شەربەت**): گیراوەکانی هەڵگری دەرمانێکن، کە کەرستەی تامبەخشی تیادا بەکاردێن.

Suspension(سوسپانسیۆن): لەگەردەکانی وردی گیراوە لەئاودا پێکهاتوون، بۆیە بەر لەبەکارهێنانی دەبێ تێك بدرێن (بشلەقێنرێن). لە ڕاچیتەی پزیشکان بەشێوەی susp دەنووسرێت.

Gel(**ژێل**): ماددەیەکی نیوەشلەو بەگیراوە دەژمێردرێتو بەئاسانی لەسەر پێست پاك دەبێتەوە.

Lotion (لۆسیۆن) شێوەیەکی دەرمانە، لەدۆخی ڕەقی دایەو زیاد لە پێویست بەکاردێتو ناتوێتەوە.

Ointment(**مەرهەم**): شێوەیەکی نیوەشلە لە دەرمانەکە، کە بەشێوەی پێست Topicalو چاوە (Ophthalmic)و لەناو ئاودا ناتوێتەوە، لە ڕاچێتەی پزیشکان بەشێوەی Oint دەنووسرێت.

Solution(**گیراوە**): بەرهەمێکی ڕەقە، کە مادەی سەرەکیو تاوتوێنەرەکەی ئاوە. لە ڕاچێتەی پزیشکان بەشێوەی Sol دەنووسرێت.

Spray: گەردیلەکانی وردی دەرمانین، بە پاڵپەستۆ سوودی لێوەردەگیرێت وەك سپرای لیدۆکائین"و سپرای بکومتازۆن لووت"و سپرای سالبوتامۆل بۆ دەمو دەمار سوودی لێوەردەگیرێت.

Powder(**تۆز پۆدەر**): شێوەی تراوو وردکراوی کەرستەی دەرمانە، دەتوانێت بەتەنیا یان تێکەڵکردن لەگەڵ ئاودا سوودی لێوەربگیرێ، وەکو پۆدرەی منداڵ یان پۆدرەی پسیلیۆم.

Pill(**وەکو حەب**): بەرهەمێکی ڕەق و بازنەیی و بچووکە، وەکو حەب لەڕێگای دەمەوە سوودی لێ وەردەگیرێت.

**هێما کورتکراوەکان لە راچێتە نووسیدا:**

پزیشکەکان لەکاتی نووسینی راچێتە لە هێماو پیتەکانی کورتکراوە سوود وەردەگرن، کە نیشاندەری شێوەی بەکارهێنانو جارەکانی بەکارهێنانی دەرمانە. بۆ ئاشنا بوون لەخوارەوە بەشێوەیەکی پوخت ئاماژەیان پێدەکەین:

IV – واتە لەناو دەمار، دوو پیتی یەکەمی (Intra Venous)ە.

IM – واتە لە ماسوولکە، دووپیتی یەکەمی (Intra muscular)ە.

Sc – واتە لە ژێرپێست، دووپیتی یەکەمی(sub cutaneous)ە.

IA – واتە لە جومگە، دووپیتی یەکەمی (Intra Articular)ە.

IL   واتە لەناو شوێنی ڕووداوەکە، دوو پیتی یەکەمی( ntra Lesional)ە.

هێما کورتکراوەکانی ژمارەی جارەکانی بەکارهێنانی دەرمان بریتین لە:

D← پیتی یەکەمی وشەی Daily، بە واتای ڕۆژانە.

qpm ← و Hs واتای شەوانە دەگەیەنێت.

BID یان ←BD واتای دووجار لە ڕۆژێك دەگەیەنێت.

←QID چوار کەرت لە ڕۆژدا.

←PRN لەکاتی پێویست بەکار بهێنرێت.

←Q6H هەر شەش کاتژمێر.

TID یان ←TDS سێ جار لە ڕۆژێکدا.

←qod ڕۆژێك نارۆژێك.

زۆربەی نەخۆشەکان لەبارەی بەکارهێنانی دڵۆپەکانی چاوو گوێ کێشەیان هەیە، بۆیە شیکردنەوەیەکی کورت لێرە دەدرێت.

## شێوەی بەکارهێنانی دڵۆپەکانی چاو (قەترەی چاو):

لەحاڵەتێکدا کە نەخۆش سەیری سەرەوە دەکات، پێڵوی خوارەوە بۆ خوارەوە بکێشرێتو دەرمانەکە لە گۆشەی چاو بکرێت، خۆتان لە دانانی دڵۆپەکان بەشێوەی ڕاستەوخۆ لەسەر پێڵوو بەدوور ڕابگرن. پاش ڕژاندنی دڵۆپەکە، پێڵوەکان بەئارامی بەردەن. شایەنی گوتنە کە هەر چاوێك دەبێ تەنیا دڵۆپێکی تێ بکرێت.

## شێوەی بەکارهێنانی مەرهەمی چاو:

وەکو تەکنیکی سەرەوە کاربکەنو لایەکی ناسك لە مەرهەمەکە لەناو پێڵووی خوارەوە دادەنرێت.

## شێوەی بەکارهێنانی دڵۆپی گوێ (قەترەی گوێ):

نەخۆش لەسەر گوێچکەی دەخەوێتو لەلای گوێی منداڵ بۆ خوارەوەو دوواوە، لە گەورەکان بۆ سەرەوەو دوواوە دەکێشرێتو دڵۆپەکە لەگوێ دەکرێت بەڕێژەی ٣تا ٥ دڵۆپ. باشترە پاش ڕژاندنی دڵۆپەکان نەخۆش بۆ ماوەی ١تا ٢ خولەك لەو بارودۆخە دابێت. بۆ بەرگرتن لە سەر گێژ بوون باشترە کە دڵۆپی گوێ سارد نەبێت.

## بەکارهێنانی دەرمانەکان لە سکپڕیو شیرداندا :

زۆربـەی دەرمانـەکان لەمنداڵدان تێدەپـەڕنو دەتـوانن ببنـە هـۆی گەیانـدنی ئاسـیوی نەویستراو بە کۆرپەلە، هـەروەها دەرمانـەکان دەتـوانن لەشـیری دایکدا بچۆڕێنو ببنـە هـۆی هەنـدێك زیـانی لاوەکییـەکان لـە سـاوا، بۆیـە خانمـە سـکپڕو شـیردەرکان دەبـێ دەرمانەکان بەباشی بەکاربێنن. ڕێکخراوی خۆراكو دەرمانی ئەمریکا

(Administration Food and Drug ( F.D.A

**دەرمانەکان لە سکپڕی بۆ پێنج گرووپ دابەش دەکات:**

**گرووپی** A- توێژینەوەکانی زانستیو تاقیگەیی مەترسیدار نەبوونی ئەم گرووپەی لە سکپڕیدا سەلماندووەو هیچ زیانێك لەسەر کۆرپەلە باس نەکراوە.

**گرووپی** B- توێژینەوە لەسەر بێچووی ئاژەڵان نیشانیداوە کە لەوانەیە کاریگەرییان هەبێت، بەڵام مەترسیداربوونیان لە مرۆڤدا نەسەلمێنراوە.

**گرووپی** C- توێژینەوەکان لەسەر ئاژەڵەکان پیشانیانداوە کە کاریگەری لەسەر کۆرپەلە هەیە. تەنانەت زیانەکانی لەناوبردنی کۆرپەلە، بەڵام توێژینەوەیەکی ڕێكو پێك لەسەر مرۆڤ نەکراوە، ئەم گرووپە تەنیا لەو دەرمانانە دەبێ بەکار بهێنرێن کە سوودەکانی گریمانییان باشترە لەمەترسی گریمانی بۆ کۆرپەلە.

**گرووپی** D- مەترسی مەرگهێنەری لەسەر مرۆڤدا هەیە، بەڵام سوودەکانی بەدیهاتوو لەبەکارهێنانی دەرمان لە ئافرەتانی سکپڕدا لەوانەیە سەرەڕای هەبوونی مەترسی پەسند بکرێت.

**گرووپی** X- بەکارهێنای ئەم گرووپە لە دەرمانەکان لەکاتی سکپڕیدا قەدەغەیە.



(ئا – س – ئا)    (A.C.A)

- ناوی بازرگانی: Excedrin

لەئێران بەناوی ئاکسار دەناسرێت.

- گرووپ دەرمانی: دژی ئێش و دژی تا
- گرووپـــی کیمیـــایی: پێکهاتـــەی ئستامینۆفن ASA (ئەسپرین و کافئین)
- شێوەی دەرمان: حـەب
- بەکارهێنانی لەسکپڕی: گرووپی C

بەکارهێنانی لەشیردان: بەوشیاری بـەکاردەهێنرێت: لـە ASA دەتـوانری بـۆ کەمکردنەوەی ژانەکانی کەم و مامناوەندو لابردنی تا سوود وەربگرێت.

ڕێژەی بەکارهێنان: هەرچوار کاتژمێر یەك حـەب و لـەکاتی پێویسـتدا بـەلانی کـەم ٨حەب لە ڕۆژدا.

بەکارهێنان: لەبـەکارهێنای ئـەم دەرمانـە بۆ زیاتر لە دە ڕۆژ لـە پێگەیشـتووان و بـۆ زیـاتر لـە شـەش ڕۆژ منداڵـەکان جگـە لـە ڕاوێژکردن لەگەڵ پزیشك خۆتان بپارێزن.

●زیانــە لاوەکییەکانــەکان: ئازارەکــانی هەرســـکردن. هێڵـــنج و ڕشـــانەوە، زیـــاد بـــەکارهێنانی ئـــەم دەرمانـــە زیـــان بەگورچـیلەکان دەگەیـەنێت، زیـادکردنی تەنگە نەفەسی.

خۆپاراسـتن: لەبرینـەکانی هەرسـکردن، تەنگەنەفەسی، پاڵاپەستۆی خوێنی بەرز، نەخۆشـــی گورچـــیلەو جگـــەر دەبێـــت بەوشیاری بەکار بهێنرێت و ئەگەر بکرێت نابێ بە نەخۆش بدرێت.

ڕاسـپاردەکانی پزیشـکی و پەرسـتیاری: لەگـەڵ ڕێژەیـەکی باشـی ئـاو یـا شـیر بەکاربهێنرێت.

هەلومەرجی هـەڵگرتن: لەشـوێنێکی وشـك هەڵبگیرێت، ئەگەر دەرمان بۆنی سرکەی لێبێ نابێت بەکار بهێنرێت.

## ئاترۆپین Atropin بۆ (چاو)

- ناوی بازرگانی: Actonorm
- گرووپی دەرمانی: ئاوەڵاکەری گلێنەی چاو
- گرووپی کیمیایی: ئەنتی کولینرژیك
- شێوەی دەرمان: دڵۆپ
- بەکارهێنانی لەسکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: ڕووداوەکانی چاو وەکو هەوکردنی لە کەپسوول، رەشێنەی چاو بۆ چارەسەرکردنی ئاوی ڕەش و بۆ ئاوەڵاکردنی گلێنەی چاو.

زیانە لاوەکییەکان: لەتاکەکانی بەساڵاچوودا نەخۆشی گورچیلەو جگەر، لەوانەیە بەشێوەی سیستماتیك هەڵدەمژرێ‌و دەبێتە هۆی وشککردنەوەی دەم، سەر ئێشەو ڕشانەوە.

فێرکردنی نەخۆش: دەرمان لەوانەیە ببێتەهۆی تاریکی بینین یان هەستیاربوون بەڕووناکی.

## ئاترۆپین سۆلفات ROPIN SULFATE

- گرووپی دەرمانی: ئەنتی کولینرژیك
- گرووپی کیمیایی: ئالکالۆئید بلادۆنا
- شێوەی دەرمان: ئەپولەکانی ٥/ملگم.
- بەکارهێنای لە سکپڕیدا: گرووپی C
- بەکارهێنان: کەمبوونی ژمارەی ترپەی دڵ، ژەهراوی بوون بە مێرووله کوژەکان‌و قرکەرەکانی ئەنتی کولین ئستراز. مەهارکردنی دفلکس واگ بەر لەنەشتەرگەری.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥/ملگم لێبدرێت‌و پاشان هەر پێنج خولەك بەپێی بڕیاری پزیشك دەرزیەکە لێبدرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، میاستنی گراویس، زیادبوونی ترپەکانی دڵ، تەنگەنەفەسی.

- زیانە لاوەکییەکانەکان: وشکی دەم، قەبزی، تینوێتی، راش، گیران‌و نەهاتنی میز، تاریك بینین، ئاوەڵابوونی گلێنە، سەرئێشە، ترپەی دڵ.

پارێزگاریەکان: نەخۆشی گورچیلە، برینی گەدە، ریفلاکس، بەرز بوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش: لەکاتی بەدەرکەوتنی هێماکانی وشکی دەم، غەرغەرەکردن بەئاو و بەکارهێنانی بنێشت رادەسپێرین.

## ئانتولول ATENOLOL

- ناوی بازرگانی: Tenormin
- گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن
- گرووپی کیمیایی: بتابلوکر
- شێوەی دەرمان: حەب ٥٠ و ١٠٠ملگم.
- بەکارهێنای لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی خوێنی کەم تا ناوەندی پێشگرتن لە هەوکردنی قورگ.

رێژەی بەکارهێنان: ٥٠ ملگم رۆژانەو لەماوەی ١تا ٢ هەفتە تا ١٠٠ ملگم شیاوی زیاد کردنە.

بەکارنەهێنان: شۆکی دڵ، کەمی لێدانەکانی دڵ، نارێکی دڵ.

- زیانە لاوەکییەکانەکان: دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، کەمی لێدانەکانی دڵ، بێ خەوی، ماندووبوونو شەکەتی، گێژبوون، ناتوانایی سێکسی، خەمۆکی، هێڵنج.

پارێزگاریەکان:

لەنەشتەرگەری گەورە نەخۆشی شەکرە، نەخۆشی گورچیلە، نارێکی دڵ، تەنگەنەفەسی، شیردان.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەراگرتنی لە ناکاوی دەرمان خۆتان بپارێزنو لەماوەی ٢ هەفتەدا هێواش هێواش.

– ئەو کاتەی کە لە دۆخی خۆدرێژکردن دان بەشێوەی لەناکاو هەڵنەستن.

**ئاتۆروڤستاتین Atorvastatin**

- ناوی بازرگانی:Lipitor
- گرووپی دەرمانی: دژی چەوری خوێن (کەمبوونی LDL و کۆلسترۆڵ)
- گرووپی کیمیایی: مەهارکەری ۳هیدرۆکسی ۳متیل گلوتاریل کوئانزیم A
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ۱۰، ۲۰، ٤۰ ملگم.
- بەکارهێنان: چارەسەری چەوری خوێن‌و کەمکردنی کولسترۆل.

ڕێژەی بەکارهێنان: نارێکی گورچیلە، سکپڕی‌و شیردان.

- زیانە لاوەکییەکانەکان: سەرئێشە، سک ئێشە، پشت ئێشە، سینوزێت سکچوون‌و هێماکانی ئەنفلۆنزا.

فێرکردنی نەخۆش: کاتی دەسپێک‌و ۲هەفتە پاش چارەسەری ئەنزیمەکانی جگەر ئەندازەگیری بکرێن.

۲مانگ پاش چارەسەری ڕێژەی LDL ئەندازەگیری بکرێت.

هاوڕێ لەگەڵ بەکارهێنانی دەرمان نەخۆش دەبێت بەشێوەی ڕێک‌وپێک وەرزش بکات‌و لە بەکارهێنانی چەوری خۆی بپارێزێت.

**ئاپومۆرفین:APO-MORPHIN HCL**

- گرووپی دەرمانی: ڕشانەوەهێنەر، ئاگۆنیست دوپامین.
- گرووپی کیمیایی: خوێی ئالکالوئید نیوە دەستکرد.
- شێوەی دەرمان: ئەمپوولەکانی۱۰ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: چێ بوونی ڕشانەوە لە ژەهراوی بوونی درمان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ۲تا ۱۰ ملگم لەڕێگەی ژێرپێستی یا ماسوولکە.

بەکارنەهێنان: ژەهراوی بوون بەکەرستەی خواردنی وەکو ئەسید، کۆما، شۆک، خەوهاتنی بەدیهاتوو لەبەکارهێنانی لاوازکەرەکانی sns وەکو ئەلکهول.

● زیانە لاوەکییەکانەکان: هێڵنج، سەرخۆشی، وشکی دەم، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، بێ ئارامی، لەرزینی دەست، خەوهاتن.

فێرکردنی نەخۆش:

– ڕشانەوە لەماوەی پێنج خولەك دوای دەرزی لێدان بەدی دێ.

– هێماکانی ژیاری نەخۆش تا ٢ کاتژمێر دوای دەرزی لێدان دەبێ کۆنترۆڵ بکرێ.

**ئادولت کولد ADULTCOL ( پەسیوی بەساڵاچووان)**

● گرووپی دەرمانی: دژی پەسیو

● گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی ئستامینۆفن، فنیل ئافرین، کلرفنیرئامین

● بەکارهێنان: چارەسەرکردنی پەسیوو ئەنفلۆنزا، سینوزێت هەستیاری، گیرانی لووت، تا، پژمین، هاتنەخوارەوەی ئاو لە لووت و ژانەکانی جومگە.

● ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتووان ٢حەب هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر (لانیکەم) ١٢حەب لەڕۆژدا.

**ئازاتیۆپرین AZATHIOPRINE**

● ناوی بازرگانی: IMUTRAN

● گرووپی دەرمانی: لاوازکەری کۆئەندامی بەرگری

● گرووپی کیمیایی: ئانالۆگ پورین.

● شێوەی دەرمان: حەبی ٥٠ ملگم

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: ئارتریت روماتۆئید و نەخۆشی لوپوس، سندرم تفروتیك. پەیوەندی گورچیلە دوای پەیوەندی مێشکی ئێسك.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە ئارتریت روماتۆئید ١ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش. لەپەیوەندیی بەپێی دەستووری پزیشك.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، گیرانی میز، پانکرا تیت، واکسیناسیۆن بە ڤایرۆسی زیندوو.

پارێزگاریەکان: لەنەخۆشی توندی گورچیلەو جگەر. وەرگرتنی گورچیلە لەتەرم. میاستنی گراو دەبێ بەوشیاری بەکاربهێنرێت.

## ئەسپرین کۆدۆئین ASA CODEINE

- ناوی بازرگانی: EMPRIN
- گرووپی دەرمانی: دژی تا، دژی ئێش
- گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی ساليسيلاتو کۆدۆئین.
- شێوەی دەرمان: حەب.
- ڕێژەی بەکارهێنان: ١ دەنکەحەب هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

## ئاسیکلۆڤیر ACYCLOVIR

- ناوی بازرگانی: Zovirax
- گرووپی دەرمانی: دژە ڤایرۆس
- گرووپی کیمیایی: ئانالۆگ نوکلئوزیدپورین
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٢٠٠و ٤٠٠ ملگم و دلۆپەکانی چاو و ئەمپوول
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: برینەکانی پێست، ئاوی لووت، بەدیهاتوو لە ڤایرۆسی هەرپس (تامیسکە)و خوریکەی مریشکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە خوریکەی مریشکانو زونا لە گەورەکاندا، ٨٠٠ ملگمو (٥)کەرت لە ڕۆژدا، لە زیپکەی کۆئەندامی زاوزێ ٢٠٠ ملگم و (٥) کەرت لەڕۆژ بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند بەدەمار.

- زیانە لاوەکییەکان: ناهاوسەنگی گورچیلەکان، لەرزینو سەرگێژبوون.

پارێزگارییەکان: لەنەخۆشی گورچیلەو جگەر، کەم ئاوی لەلەش سکپڕیو شیردان.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەهۆی گریمانەی لم لە گورچیلە لەگەڵ ڕێژەیەکی باش شلەمەنیەکان بەکاربهێنرێتو کارکردنی گورچیلەکان ئەرزیابی بکرێت.
- لەکاتی بینین، زیانەکانی وەکو شەکەتی، خوێن بەربوونو ماندوویێتی کە دەتوانێت پیشاندەری ناهاوسەنگییەکانی خوێن، پزیشك ئاگادار بکەن.

## ئاكار بۆز ACARBOSE

- ناوی بازرگانی: Precose
- گرووپی دەرمانی: دابەزێنەری شەكری خوێن.
- گرووپـــی كیمیـــایی: مەهاركـــەری ئالفاكلۆكۆزیدار
- شێوەی دەرمـان: حەبـەكانی ٥٠و ١٠٠ ملگم
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی D

بەكارهێنان لە شیردان: بە وشیاری

بـــەكارهێنان: دەرمـــانی یارمەتیـــدەر لـــە نەخۆشی شەكرە.

ڕێژەی بەكارهێنان: ٢٥٠ملگم سـێ كـەرت لەڕۆژێكدا كە دەكرێت زیاد بكرێت:

بەكارنـــەهێنان: هەســـتیاری بـــەدەرمان نەخۆشـی سـیروزی جگـەرو كتواسـیدۆزی نەخۆشـــی شـــەكرە، نەخۆشـــەكانی هـــەوكردنی ریخۆڵـــە، نـــاڕێكی گورچـــیلە، سكپڕی.

- زیانــە لاوەكییــەكان: بــای ســك، ســك ئێشەو سكچوون.

پارێزگاریـــەكان: ئـــەم دەرمانـــە لەگـــەڵ دەرمانەكانی دڵو دەمار، حەبـەكانی دژی ســـــكپڕیو دەرمانـــــەكانی ئەعســـــاب پەیوەنـــدی هەیـــەو بـــەكارهێنانی ئـــەم دەرمانە لەگەڵ ئەنسۆلین دەتوانێت ببێتە هۆی دابەزینی توندی شەكرەی خوێن.

ڕاســپاردەكانی پزیشــكیو پەرســتیاری: دەرمـــان بەرلـــە خـــواردنی خـــۆراك بـــەكار بهێنرێت.

هەلومەرجی هەڵگرتن: لە دەمای ١٥ تا ٣٠ پلە هەڵبگیرێت.

## ئالبندازۆل ALBENDAZOLE

- ناوی بازرگانی: Albenza
- گرووپی دەرمانی: دژەكرم

گرووپی كیمیایی: پێكهاتەی بنزایمیدازۆل

- شێوەی دەرمان: حەبو شرووب
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی C

بـــــەكارهێنان: چارەســـــەر بـــــۆكرمی تیناسولیوم

ڕێژەی بەکارهێنان: لە کیستی هیدائید ١٥ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش ٢ کەرت لە ڕۆژدا.

● زیانە لاوەکییەکان: زیانە لاوەکییەکان جگەر و خوێن، سەر ئێشە، هێڵنج.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە دەبێ لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت، لەماوەی بەکارهێنان دەبێت خڕۆکەکانی خوێن بژمێردرێن. ئافرەتان نابێت تا یەك مانگ دوای بەکارهێنانی دەرمان سکپڕ بن.

## ئالپرزۆلام ALPRAZOLAM

● ناوی بازرگانی: Xanax

● گرووپی دەرمانی: دژە پەشێوی، خەوهێنەر.

● گرووپی کیمیایی: بنزۆدیازیپین

شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٥ و ١ ملگم

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: پەشێوی، ناهاوسەنگی ترس، پەشێوی هاوڕێ لەگەڵ هێماکانی خەمۆکی.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە دەرمانەکە، منداڵاکانی تەمەن خوارەوەی ١٨ساڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: گێژبوون، خەوهاتن، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، تاریکی بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن بەڕێژەی زیاتر لە٢٠ مللتر جیوە دەرمانەکە نەخورێتەوەو سەردانی پزیشك بکەن.

– یارمەتیدانی نەخۆش بەهۆی خەوهاتن و گێژبوون لەدەستپێکی دەرمان.

– بۆ ئسترسەکان ڕۆژانە یان بۆماوەی زیاتر لە ٣ مانگ سوودی لێ وەرنەگیرێت.

## ئالندرۆنات ALENDRONATE

- ناوی بازرگانی: Fosamax
- گرووپی دەرمانی: دژی پووکاوی ئێسک
- گرووپی کیمیایی: مەهارکەری خانەکانی ئێسک.
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٧٠و ٣٥ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: چارەسەری پووکاوی ئێسک (ئستئۆپرۆز) لەتەمەنی لە زان کەوتن، بەرگرتن لەپووکاوی ئێسک لەنەخۆشییەکانی ئارتریت روماتۆئید، دەرمانی نەخۆشی پاژە.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتوواندا بۆ چارەسەری هەر هەفتە یەك حەب ٧٠ ملگمو بۆ ڕێگرتن یەك حەب ٣٥ ملگم لە هەفتەیەکدا.

بەکارنەهێنان: کەمبوونی کالیسیۆمی خوێن، نارێکی گورچیلە.

- زیانە لاوەکییەکان: برینو هەوکردنی سورێنچك، بای سك، ژانی ماسوولکەیی‌و ئێسك.

پارێزگاریەکان: لەگیروگرفتی هەرسکردندا بە وریایی بەکاربهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە نابێت لەگەڵ ئەنتی ئەسید بەکاربهێنرێت. چونکە دەتوانێ ببێتەهۆی سورێنچ، بۆیە نەخۆش دەبێ ئەم حەبە بە پەرداغێك ئاو بخواتو تا یەك کاتژمێر خۆی درێژ نەکات.

– بەکارهێنانی نێوان دەرمانو خواردنی کالیسیۆمدار لانیکەم دەبێت ٢ کاتژمێربێت.

پارێزگاریەکان: شیردان، نەخۆشییەکانی گورچیلەو جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

زیادکردنی بەکارهێنانی شلەمەنیەکان ٣ تا ٤ لیتر لە ڕۆژدا.

خۆپاراستن لەبەکارهێنانی مەودای وەکو ئەلکهول کافئین، کە ڕێژەی ترشەلۆکی ئۆریك زیاد دەکات.

خۆپاراستن: لەبەکارهێنانی بڕێکی زۆری ڤیتامین C چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی دروست بوونی بەردی گورچیلە.

دەرمانەکان پاش خواردن بەکار بهێنرێن.

## ئالوپورینول ALLOPURIONL

- ناوی بازرگانی:Lapurin
- گرووپی دەرمانی: دژی جومگە ژان.
- گرووپی کیمیایی: مەهارکەری ئاتریمی.
- شێوەی دەرمان: حەب ١٠٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: جومگە ژان، زیاد بوونی ترشەلۆکی ئۆریکی خوێن. بەردەکانی ئگزالاتی کالیسیۆمی.

ڕێژەی بەکارهێنان: لەجومگە ژانو هیپراوریسمی، پێگەیشتووان. ٢٠٠ تا ٦٠٠ ملگم ڕۆژانە بەپێی توندی نەخۆش.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر

- زیانە لاوەکییەکان: کەمبوونی ڕاددەی خوێن. بە تایبەت کەمبوونی خڕۆکەی سپی، سەر ئێشە، درماتیت، تەزینی دەستو پێ، (گزگزین) هەوکردنی جومگەو ماسوولکە.

## ئامفوتریسین AMPHOTERICIN

- ناوی بازرگانی: Fungizone
- گرووپی دەرمانی: دژە قارچ
- گرووپی کیمیایی: ئامفۆتریسین پلی ئەن ماکرۆئید.
- شێوەی دەرمان: ڤیالەکانی ٥٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: هەوکردنەکانی قارچی سیسماتیكو توند.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی نەزەری پزیشك.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، کەمبوونی پۆتاسیۆم، ناڕێکی گورچیلە، کەمبوونی مەگنیسیۆم.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەکاتی لێدانی گیراوە دەبێت شوێنی لێدانەکە بە (فویل) دابپۆشرێ.
- ماوەی دەرمان بەکار هێنان ٢ تا ٣ هەفتەیە.

## ئالمینیۆم هیدروکسایدALUMINIUM

- ناوی بازرگانی:Alegel- Almax
- گرووپی دەرمانی: لابەری ترشەلۆکی گەدە.
- گرووپی کیمیایی: بەرهەم گەلی ئەلمینیۆمو مەگنیسیۆم
- شێوەی دەرمان: حەبو سوسیانسیۆن.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: دژی ترشەلۆك، ریفلاکسی سورێنچك، برینی گەدەو دوازدەگرێ، زیادبوونی فسفۆر لە نارێکی گورچیلەدا.

رێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٤ حەب، چوارکەرت لە رۆژ یان ٥ تا ٢٠ سی سی لە سوسیانیسیۆن چوارجار لە رۆژدا.

بەکارنەهێنان: نارێکی گورچیلە، ئاپاندیس (زیادە ریخۆڵە)، خوێن بەربوون لەکۆم، سکچوونی درێژخایەن، گیرانی رێگەی دەرچوونی گەدە یان ریخۆڵە.

- زیانە لاوەکییەکان: قەبزی، کەمبوونی ئارەزووی خواردنو لاوازی ماسوولکەیی.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەوانەیە بەهۆی کەمدانی فسفۆر ببێتە هۆی لاوازی ماسوولکەییو بێ تاقەتی.
- پاشەڕۆ لەوانەیە سپیو لەکەدار بێت.
- خۆپاراستن لەبەکارهێنانی خواردەمەنی فسفۆردار (زۆربەی بەروبوومی شیرەمەنی، هێلکە، میوەو نۆشابەکانی گازدار لەکاتی چارەسەر.

## ئامانتادین AMANTADINE

- ناوی بازرگانی: Symmetrel
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی ویرال، دژی پارکینسۆن
- گرووپی کیمیایی: ئامینی سێ بارنەیی.
- شێوەی دەرمان: کەپسوولی ١٠٠ ملگم

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: ڕێگرتن یا چارەسەری ئەنفلۆنزای بەدیهاتوو لە ڤایرۆسی جۆری A، چارەسەری زیانە لاوەکییەکان دەرمانی (ئکسترا- پیرامیدال)و پارکینسۆل. لە ئەنفلۆنزا ٢٠٠ ملگم لە ڕۆژدا، لە پارکینسۆل ١٠٠ ملگم دووجار لە ڕۆژدا تا ٤٠٠ ملگم.

بەکارنەهێنان: شیردان، منداڵەکانی تەمەن خوارەوەی یەك ساڵ، سکپڕی.

● زیانە لاوەکییەکان: گێژبوون، تێکچوونو پەشێوی، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، وشکیی دەم، تاریك بینین، کەمبوونی خڕۆکەی سپی، دووبارەبوونەوەو گیرانی میز.

پارێزگارییەکان: شڵەژاوی، ناڕێکی دڵ، دابەزینی پاڵپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش: - لانیکەم ٤ کاتژمێر بەر لە نووستن بەکاربهێنرێت تا بەرگری لە بێ خەوی بکات.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

## ئەمپی سیلین AMPICLLIN

● ناوی بازرگانی: Amcill- Ampicin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● گروپی کیمیایی: گرووپی پنیسیلینەکان

● شێوەی : کەپسوولی ٢٥٠،٥٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: هەوکردنەکانی کۆئەندامی هەناسە، هەوکردنی پەردەی مێشك .

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٤گم ڕۆژانە لە کاتەکانی دابەشکراو هەر ٦ کاتژمێر.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە پنسیلینەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: سکچوون، بێ تاقەتی، پەشێویو شڵەژاوی.

پارێزگارییەکان: ساوایان، هەوکردنی مونۆنۆکلۆز.

فێرکردنی نەخۆش: - لەهەر چەشنە قورگ ئێشەو شەکەتیو سکچوونێك پزیشك ئاگادار بکرێت.

- ماوەی دەرمان ١٠ تا ٤ ڕۆژە.

## ئاملۆدیپین AMLODIPINE

● ناوی بازرگانی: Norvasc

●گرووپــی دەرمــانی: دژی پاڵەپەســتۆی خوێن

● گرووپــی کیمیــایی: بــەلول کــەرەکانی کەناڵی کالسیۆم

● شێوەی دەرمان: حەب ٥ ملگم

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: بۆ پاڵەپەستۆی خوێن

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تـا ١٠ ملگـم ڕۆژانـە لە دووکاتی دابەشکراو.

بەکارنــەهێنان: هەســتیاری یــەکجار زۆر بەدەرمان.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێڵـنج، هەناسەتەنگی، ترپەی دڵ، قەبزی.

پارێزگاریەکان: لە تەنگی ئائورت، نارێکی دڵو نــــارێکی جگـــەر بـــە وریـــایی بەکاربهێنرێت.

## ئامۆکسی سیلین AMOXICLIN

● ناوی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● گرووپــی دەرمــانی: گرووپــی پــنی سیلینەکان

● شێوەی دەرمـان: کەپسوولەکانی ٢٥٠ ٥٠٠ ملگـم سوسیانسـیۆکانی (تـۆز) ١٢٥و ٥٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕێگە پێدراوە.

بــەکارهێنان: هەوکردنــەکانی کۆئەنــدامی هەناســــە (لــــەوزەتێن- سینوســــەکان- گوێیەکان) پێست، میزڵدان.

ڕێژەی بـەکارهێنان: خـۆراکی ٢٥٠ تـا ٥٠٠ ملگم هەر ٨ کاتژمێر.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە پنی سیلین- ساوایان- کەم خوێنی، نارێکی کۆئەندامی هەرس.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵـنجو ڕشـانەوە، ناهاوسەنگی گورچیلە.

- مــاوەی دەرمــان بــەکارهێنان تــەواو بکەن.

فێرکردنی نەخۆش:

– کەپسوولەکە بەگەدەیەکی بەتاڵو بە ڕێژەیەکی زۆر شلەمەنی بخۆن.

– لەکاتی سکچوون پزیشک ئاگادار بکەنەوە.

**ئامی تریپتیلین AMITRIPTYLINE**

- ناوی بازرگانی: Amitril
- گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی
- گرووپی کیمیایی: ئامین سێ
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٢٥ و ٥و ١٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: خەمۆکیو ژان

ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان ٥٠ تا ١٠٠ ملگم کاتی نووستنو ٤٠٠ ملگم ٤ جار لە ڕۆژدا بەلایەنی زۆر تا ٣٠٠ ملگم ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری خەمۆکیو ژان.

- زیانە لاوەکییەکان: گێژ بوون، خەوالّوویی‌و سکچوون، وشکیی دەم، گیرانی میز، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، تاریکی بینین، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی، ئارەقکردن.

پارێزگارییەکان: هیپرترۆنی، پرۆستات، خەمۆکی توند، گیرانی میز، لە نەخۆشی جگەر و گورچیلە دەبێت بە وریایی بەکاربهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

– کاریگەرییەکانی چارەسەرکردن ١ تا ٢ هەفتە بەدەر دەکەون.

– خۆپاراستن لەخواردنەوەی ئەلکهول.

لەڕاگرتنی لەناکاوی دەرمان پاش ماوەیەکی بەکارهێنانی درێژخایەن بەهۆی بەدیهاتنی زیانە لاوەکییەکان هێڵنجو سەرئێشەو بێ تاقەتی، ڕێگری بکرێ.

– لەوانەیە ڕەنگی میز بۆ ڕەنگی شین بگۆڕدرێت.

## ئامیکاسین SULFATE AMIKACIN

- ناوی بازرگانی: Amikin
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك
- گرووپی کیمیایی: ئامینو گلیکۆزید
- شێوەی دەرمان: ئەمپوولەکانی ١٠٠و ٥٠٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: هەوکردنەکانی توندی مێشك، میزو میزەڕۆ.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە هەوکرنەکانی توند، لێدانی ئەمپوول لە دەمار ١٥ ملگم بۆ هەر کگم کێشی لەش لە دوو یان سێ کاتی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: نەخۆشی توندی گورچیلەیی‌و هەستیاری بەئامینۆگلیکۆزیدەکان. کەمبوونی ڕێژەی میزو کارکردنی گورچیلە. کەمبوونی خڕۆکەکانی خوێن‌و کێشەکانی ماسوولکەیی.

پارێزگاریەکان: لە ساوایان میاستنی گراویس، سکپڕی‌و شیردان. نەخۆشی پارکینسۆل‌و بەساڵاچووان بە وریایی بەکاربهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

– پێدانی شلەمەنی تەواو ٢ تا ٣ لیتر لە ڕۆژدا، بیستن‌و پزیشك ئاگادارکردن – لەهەر چەشنە ناهاوسەنگی بیستن‌و سەرگێژە یان هەستکردن بەهەبوونی دەنگ لە گوێ، یان هەستکردن بە پڕبوونی گوێ.

## ئامیلوراید AMILOR!DE-H

- ناوی بازرگانی: Moduretic
- گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن.
- گرووپی کیمیایی: دیورتیك (میزهێنەر)
- شێوەی دەرمان: حەب ٥ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: سیروزی جگەر، چارەسەری پاڵەپەستۆی خوێن‌و ئادم (ئاوسانی گشتی) بەدیهاتوو لە نارێکی دڵ. هەندێك جار لەبارەی بەردی

گورچیلەو پرمیزی بە دیهاتوو لە
چ رەسەرکردن بە لیتیۆم.
ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە یەك حەبو
بەلایەنی زۆر ٤ حەب لە ڕۆژدا.
بەکارنەهێنان: پۆتاسیۆمی خوێن زیاتر لە
ـ. نارێکی درێژخایەنی گورچیلە بەتایبەت
ـە نەخۆشەکانی شەکرەدا، ناهاوسەنگی
ـە کارکردنی جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشەو
گێژبوون، زیادبوونی بوونی پۆتاسیۆمی
خوێن، کەمبوونی خرۆکەکانی خوێن،
بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێنی ناو
چاو، گیرانو سووتانەوەو میزهاتنەوەی
زۆر، ناتوانایی سێکسی، سك ئێشە.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشتر وایە دەرمانەکە کاتی بەیانی
بەکار بهێنرێت.

- لە بەکارهێنانی هاوکاتی ئاوی میوە
یان خواردەمەنی پۆتاسیۆمدار خۆتان
بپارێزێت.

- ڕادەسپێردرێت لەماوەی بەکارهێنانی
دەرمان لەسەرەتادا بەهۆی گریمانەی
ناهاوسەنگیەکانی بینینو سەرگێژبوون.

## ئامینوفیلین AMINOOHYLLINE

● ناوی بازرگانی: Amoline

● گرووپی دەرمانی: دژی ئسپاسم –
دژی تەنگەنەفەسی.

● گرووپی کیمیایی: بەرهەم گەلی
گزانتین، ئتیلن دیامید.

● شێوەی دەرمان: حەبەکانی ١٠٠ ملگمو
ئەمپوولەکانی ٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: تەنگە نەفەسی، نارێکی دڵ
بەهۆی ناهەوسەنگی ڕیخۆڵە

ڕێژەی بەکارهێنان: لەپێگەیشتووان،
سەرەتا ٦ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی
لەش.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بە
گزاتینەکان، زیادکرنی نارێکی ترپەکانی
دڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: پەشێوی، شڵەژاوی، سەرگێژی، نائارامی، ترپەی دڵ، هێڵنجو رشانەوە، لەرزینی دەستەکان.

پارێزگارییەکان: لەتاکەکانی بەتەمەن، نارێکی دڵ، نەخۆشی جگەر، نەخۆشی برینی چالاکی گەدە. تیرۆئید، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن،

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لەکاتی هەبوونی هێماکانی ژاراوی بوون وەکو بێ خەوی، پەشێوی، هێڵنج، رشانەوە، خێرا لێدانی ترپەی دڵ، شڵەژاوی.

– خۆپاراستن لەدەرزی لێدانی ماسوولکەیی، چونکە لێدانەکە ترسناکە.

## ئامیودارۆن AMIODARONE

● ناوی بازرگانی: Cordaron

● گرووپی دەرمانی: دژی ئارتیمی (ناهاوسەنگی لە رێکی دڵ)

● گرووپی کیمیایی: (بەرهەمی بنزو فوران)

● شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٢٠٠ ملگمو ئەمپوولەکانی ١٥٠ ملگم.

بەکارهێنان: بەرگرتنو چارەسەری نارێکییەکانی دڵ

رێژەی بەکارهێنان: کاتی دەستپێکی سەرەتایی رۆژانە ٨٠٠ تا ١٦٠٠ ملگم بۆ ماوەی ١ تا ٣ هەفتەو پاشان ٢٠٠ تا ٦٠٠ ملگم رۆژانە.

بەکارنەهێنان: کەمبوونی توندی ژمارەکانی ترپەی دڵ

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، گێژبوون، کەمبوونی ژمارەکانی ترپەی دڵ. ناهاوسەنگی لە ریتمی دڵ، هەستیاری بەرووناکی، تاریکی بینینو ترس لەرووناکی، ناهاوسەنگی لەکارکردی

ـیرۆئید، هەوکردنی ڕیخۆڵەو فیبرمەزی ـیخۆڵە، ڕەش‌و شین بوونی پێست.

ـ ڕێزگاریەکان: لەناهاوسەنگی تیرۆئید، هەستیاری بە یۆد، کەمبوونی ژمارەی ـرپەکانی دڵ، سکپڕی‌و شیردان.

ـیرکردنی نەخۆش: لە بەرخۆر مەوەستن تا لەسووتانی ڕێگری بکرێ.




- ناوی بازرگانی: Xyloproct

گرووپی دەرمانی: مایەسیری

- گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی دەرمانەکانی دژی مایەسیری
- شێوەی دەرمان: پێکهاتەی لیدۆکائین، هیدروکۆتیزۆن، ئەلمینیۆم، زینك ئکساید.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: چارەسەرە بۆ مایەسیری دەرەوە. قەڵشاوی کۆم، خورانی کۆم.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی پێویست دوو یان چەندجار.

- زیانە لاوەکییەکان: هەستیاری، خوران.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگادارکردنی پزیشك کاتی هەوکردنی هەستیاری، خوران، پێویستە دەرمانەکە بەکارنەهێنرێت.




- ناوی بازرگانی: Naldecon
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی هستامین، ئانتاگۆنسیت وەرگری H1
- گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی فنیل ئافرین‌و ئانتاگۆنیست
- شێوەی دەرمان: حەب

بەکارهێنان: داگیراوی ئاهاتن لە لووت‌و سینوسەکان بەهۆی هەڵامەت، هەستیاری وەرزی.

ڕێژەی بەکارهێنان: لەپێگەیشتوان یەك حەب ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

## ئستازۆلامید ACETAZOLAMIDE

- ناوی بازرگانی: AK-ZOL (دیاموکس)
- گرووپی دەرمانی: میزهێنەر، مەهارکەری ئانزیمی کربنیك ئان.
- گرووپی کیمیایی: بەرهەمی سولفانامید.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥٠ملگم و ئەمپوولەکانی٥٠٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان:

ڕێژەی بەکارهێنان: لە گلوکۆمدا، ٢٥٠ ملگم هەر ٤ کاتژمێر لە ئادم دا ٢٥٠ ملگم پاش نیوەڕۆ لە شلەژاوی٣٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش.

بەکارهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بە سولفونامیدەکان، نەخۆشی توندی گورچیلە، نەبوونی هاوسەنگی ئلکترۆلیتەکان، (کەمبوونی سۆدیوم و پۆتاسیۆمی خوێن، ئسیدۆز، نەخۆشی ئادیسۆن.

- زیانە لاوەکییەکان: خەوالّوویی، نزیك بین وزەوزی گوێ، زیادبوونی شەکری خوێن، هەستیاری بەڕووناکی.

ڕاسپاردەکانی پزیشکیو پەرستیاری:

– تا بکرێت بە شێوەی خۆراکی یا دەمار بەکاربهێنرێت. لێدانی ماسوولکەیی بە ژانە.

– بەهۆی ئەوەی ئەم دەرمانە میزهێنەرە، کێشە بۆ خەو بەدی دێت. بەیانیان بەکاربهێنرێت.

– لەکاتی بەدیهاتنی هێلّنج لەگەلّ خۆراك بەکاربهێنرێت، هەرچەندە هەلّمژینی تارادەیەك کەم دەبێت.

فێرکردنی نەخۆش: لەکاتی هەبوونی قورگ ئێشە، خوێن بەربوونی ناسروشتی، هەستکردن بە گزگزینی گوێ لەئەندامەکان. خۆپاراستن لەئەنجامدانی کاری مەترسیدار لەکاتی خەوالّوویی.

## ئستامینۆفن ACETAMINOPHEN

- ناوی بازرگانی: Paracetamol
- گرووپی دەرمانی: دژی ژان، دژی تا
- گرووپـــــی کیمیـــــایی: بەرهــــــەمی پارائامینۆفنل
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ۳۲۵و ٥٠٠ ملگم شرووب ۱۲۰ ملگم لـە CC٥ (پێـنج سی سی) فنیل ۱۲٥و ۳۲٥ ملگم، دڵۆپی ۱۰۰ ملگم لەهەر سی سی
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بــەکارهێنان: تــا، ژانـــەکانی کــەم تــا مامناوەند.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشـتووان: یـەك حـەب هـەر ٤ تـا ٦ کاتـــژمێر بـــەپێی پێویســـت، لانـــی زۆر بەکارهێنانی ٤ گرام لەڕۆژ (واتـە ٨ تـا ۱۲ حەب).

منـدالآن: ۱۰ تـا ۱٥ ملگـم بـەپێی کێشـی لەش لە هەرجارێك بەکارهێنان ۲ دلۆپ بۆ هەر کیلۆگرام لەلەشی مندالّ دەدرێ.

بەکارنـەهێنان: نەخۆشـی تونـدی جگـەر، هەستیاری یەکجار زۆر بەدەرمان.

- زیانـە لاوەکییـەکان: هێڵـنج، ڕشـانەوە ژانە سك، گێژبوون.

پارێزگاریـەکان: کـەم خـوێنی نەخۆشـی گورچـیلە (ئەلکیسـم)ی درێـژ خایـەن بەوریای بەکار بهێنرێت.

ڕاسپاردەکانی پزیشکیو پەرستیاری: دەکـرێ حـەبی ئسـتامینۆفن ورد بکـرێو بـەکار بهێنرێـت، بۆکـەمبوونی هێماکـانی هەرسـکردن لەگـەڵ خـۆراك یـان شـیر بەکاربهێنرێت.

فێرکردنـی نـەخۆش: – زیـاد لـە ڕاددەی دیاریکراو بەکارنەهێنرێ، چونکە لەوانەیە ژەهراوی بوونی جگەر بەدی بێنی.

– بـەکارهێنانی بـێ ویسـتی پزیشـك بـۆ زیاتر لە ۱۰ ڕۆژ بـۆ پێگەیشـتووانو زیـاتر لە ٥ ڕۆژ بۆ مندالآن قەدەغەیە.

– بـەکارهێنانی دەرمـان لـەژێر چـاودێری پزیشـك ئەگـەر (تـا) زیـاتر لـە سـێ ڕۆژ درێژەی هەبوو– تای زیاتر لە ۳۹/٥پلە.

## ئستامینۆفن کۆدئین ACETAMINOPHENCODEIN

- ناوی بازرگانی:
Tylenol- phenophen
- گرووپی دەرمانی: دژی ئێش، دژی تا
- گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی ئستامینۆفنو کۆدئین، کە هەر حەب ٣٢٥ ملگم ئستامینۆفنو ١٠ ملگم کۆدئینە.
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٢٥٠ ملگمو ئەمپولی ٥٠٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

ڕێژەی بەکارهێنان: لەپێگەیشتووان ١ تا ٢ حەب هەر ٤ کاتژمێر.

بەکارنەهێنان: لەمندالّی خوار ٣سالّ

## ئستیل سیستین ACETYLCYSTEINE

- ناوی بازرگانی: Parvolex
- گرووپی دەرمانی: شلکەری بەلّغەم، ئەنتی دوت ئستامینۆفن (دژو لابەری ئستامینۆفن)
- گرووپی کیمیایی: ترشەلۆکی ئامینە L- سیستئین.
- شێوەی دەرمان: حەب - ڤیالّ
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: ژەهراوی بوون بە ئستامینۆفن، برونشیت، پنومونی.

ڕێژەی بەکارهێنان: یەك حەب ٦٠٠ ملگم هەر ١٢ کاتژمێر لە پێگەیشتووانو ژەهراوی بوون بە ئستامینۆفن بەپێی قسەی پزیشك.

بەکارنەهێنان: هەستیاری لە رادەبەدەر، بەرزبوونەوەی فشاری ناو قاپێلکەی سەر.

- زیانە لاوەکییەکان: گێژبوون، خەوالّوویی، دابەزینی پالّەپەستۆی خوێن، ئسپاسم برونش.

فێرکردنی نەخۆش: خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول و مەهارکەرەکانی چالاکی مێشك لەگەڵ ئەم دەرمانە.

**ئستیل سالیسیلیك ئەسید A.S.A**

- گرووپی دەرمانی: دژی ئێش، دژی هەوکردنی نائسترۆئیدی
- گرووپی کیمیایی: سالیسلات
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ١٠٠و ٣٢٥ مایگم و حەبەکانی پۆشش داری ٥٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: تاو ژانەکانی کەم، هەوکردنی جومگە، پەلاماری دڵو مێشك

ڕێژەی بەکارهێنان: دژی ئێشو دژی تا.

لە پێگەیشتووان: ٦٥٠–٣٢٥ملگم هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر. لایەنی زۆر ٤گم لە ڕۆژدا.

لە منداڵەکان: ٩٠ تا ١٣٠ ملگم بۆ هەر ١ کیلۆگرام هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

بەکارنەهێنان: لە منداڵی تووش بوو بە خوریکەی مریشکان، هەبوونی برینی گەدەو یا هێماکانی خوێن بەربوونی هەرسکردن، نەخۆشانی تووش بوو بە تەنگەنەفەسیو کەمبوونی ڤیتامین K

- زیانە لاوەکییەکان: وزەوزی گوێو کەمبوونی بیستن. خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرسکردن.

پارێزگاریەکان: بەکارهێنانی درێژخایەنی ئەسپرین دەتوانێت ببێتە هۆی لەدەستدانی خوێن.

**فرمێسکی دەستکرد ARTIFICI TEAR**

- ناوی بازرگانی: Adapettes
- گرووپی دەرمانی: فرمێسکی دەستکرد
- گرووپی کیمیایی: بەرهەم گەلی پلیو ینیل ئەلکهولو سلولز
- شێوەی دەرمانی: دلۆپی چاو
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: لابردنی وشکیو ڕژاندنی چاو لەکاتی ئاسیوی ڕژێنەکانی فرمێسك بۆ نەرمکردنی چاو کاتی سوود وەرگرتن لە لێنز.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر

● زیانــە لاوەکییــەکان: تاریــك بیــنین، سووتانەوەی چاو.

فێرکردنی نەخۆش:

– باشتروایە لەکاتی سوود وەرگرتن لـەم درمانە لە لێنزی نەرم سوود وەرنەگیرێ.

– نابێ زیاتر لە سێ ڕۆژ سوود لـە درمـان وەربگرێ.

– نابێ سـەری دلۆپچـەکان لەگـەڵ پێڵـوو یان چاو پەیوەندی هەبێت.

– ئاگادارکردنەوەی پزیشك لەهەر چەشنە چاو ئێشە، سەر ئێشەو سووری چاو.

**فاکتۆری دژی همۆفیلی**

**(نەخۆشی خوێن نەگرسانەوە)**

ANTIHEMOPHILIC FACTOR

● نـــاوی بازرگـــانی: Factorate- Humafac

● گرووپی دەرمانی: بەستێنەری خوێن

● گرووپی کیمیایی: فاکتۆری هەشت

● شـێوەی دەرمـانی: ڤیـالی تـەزریقی، ٢٥٠و ٥٠٠ یەکە.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: همۆفیلی A

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ٢٠ یەکە بۆ هەر ١ کلگم کێشی لەش هەر ٨ تا ٢٤ کاتـژمێر گرێـدراو بـــە شــوێنی خـــوێن بـــەربوون لەرێگەی دەمار.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، رشـانەوە، تاو لەرز.

پارێز گاریـەکان: سـاوایان و منـداڵانی ژێـر ٢ســاڵ، نەخۆشــی جگــەر، گرووپــەکانی خوێن -A- B- AB و سـکپڕی (گرووپـی C)

فێرکردنی نەخۆش:

–خۆپاراستن لەبەکارهێنانی سالسیلات تاك بەرلێدان دەبێ لەبەرامبەر هپاتیـت B ئیمونیزە بکرێت.

– ڕاپـــۆرتکردن هەرچەشــــنە زیــــانی لاوەکییەکان وەکو خوێن بەربوون لە پوو، یان خوێن لە میزو پاشەڕۆ.

**ڤیتامین ASID – CASCORBIC**

- نــاوی بازرگــانی:Arco- cee، Ascorbicap
- گرووپی دەرمانی: ڤیتامین C
- گرووپی کیمیایی: ڤیتامینەکان
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۱۰۰و ۲۵۰ ملگــم حەبــەکانی کــولاو ۱۰۰ ملگــم و تۆزەکانی ۵۰۰ ملگم، دەرزی ۵۰۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بــــەکارهێنان: ڕێگــــرتن و چارەســــەری ئســکوروی یارمــەتی بەچارەســەرکردنی سووتانەکانی توند. چاکبوونەوەی شکان یان برین. نەخۆشییەکانی درێژخایەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدراو بـە پێویسـتی ڕۆژانە ۱۰۰ تا ۲۰۰ ملگم لە ڕۆژدا.

- زیانــــە لاوەکییــــەکان: سکچــــوون، سووتانەوەی سـەری دڵ، زیـادبوونی میـز کـردن، ئورتریــت، ســووتانەوە لــەکاتی میزکردن، کریستالۆری، بێ خەوی.

پارێزگاریەکان: لە نەخۆشەکانی تووشبوو بــە جومگــە ژان گورچــیلە، بــە وریــایی بەکاربهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

ڤیتــامین C دەتوانێــت ببێتــە هــۆی زیادبوونی هەڵمژینی ئاسن.



## B.C.G ب.س.ژ

● گرووپـــی دەرمـــانی: پێکوتـــە – دژی شێرپەنجە.

● گرووپی کیمیایی: پێکوتەی دژی سیل

● شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ٧٥گرامی

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: شێرپەنجەی پێست، تۆمۆری سەرەوەی میزڵدان، شێرپەنجەی مەمك، واکسیناســـیۆنی ئەوتاکانـــەی کـــە پەیوەنـــدییان لەگـەڵ نەخۆشـــی ســـیل هەبووە.

بەکارنـــەهێنان: ئایـــدز، واکسیناســـیۆنی خوریکـــە، ســـووتان، کورتـــون ترابـــی، سکپڕی.

● زیانە لاوەکییەکان: ئاوسانی ڕژێنەکانی لنفـــاوی. هەســـتیاری ئەســـتۆو ملـــت (هەوکردنی ئێسك).

فێرکردنی نەخۆش:

- شـــوێنی لێـــدانی دەرزیەکـــە تـــا ٢٤ کاتژمێر وشك ڕاگرن.

- تستی پێست توبوکۆلین (PPD) ٢ تا ٣ مانگ پاش پێکوتە ئەنجام بدەن.

## B-COMPLEX ب – کمپلکس

● ناوی بازرگانی:Bectal

● گرووپی دەرمانی: ڤیتامین گرووپی B

● گرووپی کیمیایی: ڤیتامینی گیراوە لـە ئاو.

● شـێوەی دەرمـانی: حـەب، شـرووب، ئەمپوول.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بـەکارهێنان: چارەسـەری یـان پێشـگرتن لەکەمی ڤیتامینەکانی گرووپی B

ڕێـــژەی بـــەکارهێنان: بـــەپێی خواســـتی پزیشك.

● زیانــە لاوەکییــەکان: لــە ناوچــوونی یێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـادارین لـەکاتی لێـدان (ئـەمپوول) رملی نەبێت.

– لەگەڵ خواردن بەکار بهێنرێت.

**باریم** BARIUM SULFATE

● ناوی بازرگانی:Baricon

● گرووپی کیمیایی: بەرهەمی سۆلفات

● گرووپـی دەرمـانی: مـاددەی حـاجبی کۆئەندامی هەرس.

● شــێوەی دەرمـانی: تۆزەکـانی ١٣٥ گرامی.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D

بـەکارهێنان: ئـەم دەرمانـە لـە وێنـەگرتن لەڕێرەوی هەرسـکردن بـە سوودوەرگرتن لە تیشك.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە گـراف گـەدەدا ٤٠٠ تا ٤٥٠ گـمو لـە ریخۆڵـەی گـەورە ١٥٠ تـا ٧٥٠ گم.

بەکارنەهێنان: گیرانی کۆئەندامی هەرس.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: قـــەبزی، کۆبوونـەوەی پاشـەڕۆی ڕەقبـوو، گیرانـی ریخۆڵـەو ئاپانـدیس پـاش پاککردنـەوەی دەرمان.

فێرکردنی نەخۆش:

– باشـتروایە شـەوی بـەر لـە وێنـەگرتن، نــەخۆش لــە ڕوونــی گەرچــەك ســوود وەربگرێ.

– لەگــەڵ دەرمانەکــەدا ئــاوێکی زۆر بخورێتەوە، چـونکە لەوانەیـە نەخۆشـەکە تووشی قەبزی بێت.

**بای پیریدن** BIPERIDEN

● ناوی بازرگانی:Akineton

● گرووپــــی دەرمــــانی: مەهارکـــەری هێمایـــــەکانی ئکســــــتراپیرامیدل دژی پارکینسۆن.

● گرووپی کیمیایی: ئەنتی کولینرژیك

● شـێوەی دەرمـانی: حــەبی ٢ملگــم، ئەمپولی (٥) ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بــەکارهێنان: پارکینســۆڵو هێمایــەکانی ئکســترایپیرامیدل وەکــو ژاراوی بــوون بــە متۆکلۆپرامید.

بەکارنــەهێنان: ئــاوی رەشــی چــاو- میاستنی گراویس، گیرانی ریخۆڵە، بـرینی گەدەو دوازدەگرێ، میزگیران.

- زیانــە لاوەکییــەکان: پەشــێوی، بــێ ئۆقرەیی، شلەژاوی، تاریك بیـنین، تـرس لــەڕووناکی، لێڵــی گلێنــە، وشــکی دەم، قەبزی. هێڵنج، میزگیران، لاوازی.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراســتن لــە ڕاگــرتنی لــە ناکــاوی دەرمان.

- خۆپاراســـتن لـــە بـــەکارهێنانی دەرمانـــەکانی هەلامـــەت کـــە مـــاددەی ئــەلکهولی تێدایــەو ئــەنی هیســتامینەکان جگە بەپێی ویستی پزیشك.

## باسیتراسین BACITRACIN

- نــاوی بازرگــانی:-BaciquentAk-Tracin
- گرووپــی دەرمــانی: ئــەنتی بیــوتیکی شوێنی.
- گرووپی کیمیایی: ئەنتی بیوتیك
- شـێوەی دەرمـانی: دڵۆپــەکانی چـاو و مەرهەمەکانی چاو.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: هەوکردنی چاوو پێست.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار لـە شوێنەکە.

- زیانە لاوەکییەکان: هەوکردنو ڕژاندنی کــاتی، ســووتانەوە، خــوران، گەشــەی میکرۆبەکانی هەستپێکراو.

فێرکردنی نەخۆش:

لەوانەیەکاتی بەکارهێنانی مەرهـەم تاریـك بینین بەدیبێت.

## باکلۆفن BACLOFEN

- ـوی بازرگانی: Lioresal
- گرووپـــــی دەرمـــــانی: شــــلکەری ـ ـەرولکەکانی ئێسکە پەیکەر.
- گرووپی کیمیایی: بەرهەمی کلۆرۆفنیل ـ ـ.
- شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١٠و ٢٥ ـگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: C

ـەکارهێنان: دژی ئسپاسمی ماسوولکە لـە ـەوتانی دڕکەپـەتك‌و مولتیپـل ئـسـکلروز (M.S

ـڕێژەی بەکارهێنان: لە ٥ ملگم سێ کـەرت ـە ڕۆژدا دەست پێدەکرێ‌و هەرسێ ڕۆژ ـملگم زیاد بکرێت تا ٨٠ ملگم لە ڕۆژدا.

- زیانە لاوەکییـەکان: گێـژبوون، لاوازی، شـەکەتی، خــەواڵوویی، تاریـك بیـنین، ـزەوزی گـوێ، دابــەزینی پاڵەپەسـتۆی خـوێن، هێڵـنج، قـەبزی، وشـکی دەم، ـدووبارەبوونەوەی میز، میزگیران.

ـفێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراسـت لـە ڕاگـرتنی لـە ناکـاوی دەرمـان بـەهۆی گریمانـەی شـڵەژاوی‌و زیانـەکانی وەکـو پەشـێوی ئسپاسـتین‌و زیادبوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هاوکات لـە ئـەنتی هسـتامینەکان‌و دژی کۆکـەکان، جگە لەوکاتەی پزیشك داوای کردبێت.

– کـۆنترۆڵکردنی شـەکر و کـارکردنی جگـەر، ئەگـەر مـاوەی بـەکارهێنان درێژخایەن بێت.

## بیتامیتازۆن BETAMETAZONE

- ناوی بازرگانی: Celestone
- گرووپـی دەرمـانی: دژی هـەوکردنی ئستێرۆئیدی.
- گرووپی کیمیـایی: گلوکۆکۆرتیکۆئیـد، کاریگەریی درێژخایەن.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٤ ملگم و ئەمپولەکانی ٤ ملگم .
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: C

بەکارهێنان: هەوکردنی توند.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٦ /٠ تا ٧/٢ ملگم خۆراکی.

بەکارنەهێنان: شێتاتی، هەوکردنەکانی کەڕووو لاکۆتی (ئەنگەل) دەردەباریکە.

زیانە لاوەکییەکان: پەیدابوونی زیپکە، دواکەوتن لە چاکبوونەوەی برینەکان، ڕەش‌و شین بوونی پێست، خەمۆکی سەرئێشە، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن. پووکاوی ئێسك، سکچوون، هێڵنج، خوێن بەربوون لە کۆئەندامی هەرس، زیادبوونی ئارەزووی خواردن، تاریك بینین، زیادبوونی مەترسی، بە هەوکردنەکانی کەڕوو.

پارێزگارییەکان: نەخۆشی شەکرە، پووکاوی ئێسك، ناهاوسەنگییەکانی گەشە، میاستی گراویس، برینی پپتیك، نەخۆشی گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– بۆ ڕێگرتن لە مەهار و ساپرس بوونی ئادرنال بەشێوەی یەك دان‌و بەیانیەکان سوودی لێوەربگیرێ. بەشێوەی ژێرپێست سوودی لێوەرنەگیرێ.

– باشتروایە دەرمانەکە لەگەڵ خواردن یان شیر سوودی لێ وەربگیرێ.

– خۆپاراستن لە راگرتنی لە ناکاوی دەرمان. دەرمانەکە دەبێ هێواش هێواش‌و لانیکەم لە ماوەی یەك هەفتە رابگیرێ.

## بتامتازۆن (چاو-گوێ) BETAMETAZONE

- ناوی بازرگانی: Betnesol
- گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی ئستێرۆئید.
- گرووپی کیمیایی: گلوکۆکۆرتیکۆئید
- شێوەی دەرمانی: دڵۆپ ١/٠ لە سەدا

بەکارهێنان: هەوکردنی رەشێنەی چاو- پەچەکردارەکانی ئالەرژیکی چاو، هەوکردنی بەشی ناوەوەی پێڵووی چاو (ما تحمه) هەوکردنی گوێی دەرەوە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ دڵۆپ هەر ٢ کاتژمێر کە بەکەم بوونی ڕێژەی هەوکردنەکە دەکرێ ڕێژەی بەکارهێنان کەم بکرێت. بۆ زانیاری زیاتر سەیری بیتامیتازۆن سیستیك بکەن.

## بیتامیتازۆن – ان BETAMETAZON-N

- گرووپی بازرگانی: Betnesol-n
- گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی ستیرۆئید.
- گرووپی کیمیایی: پێکهاتەی گوکۆکۆرتیکۆئید– ئەنتی بیوتیك.
- شێوەی دەرمانی: دلۆپی چاوو گوێ، گیراوەو مەرهەم.

بەکارهێنان: نەخۆشیەکانی هەوکرنی چاوو گوێو لووتو درماتیتەکان.

## بیتاکسۆلول BETAXOLOL

- ناوی بازرگانی: Betoptic
- گرووپی دەرمانی: چارەسەر بۆ ئاوی ڕەش (گلوکۆم).
- گرووپی کیمیایی: کۆنترۆلکردنی بتا.
- شێوەی دەرمانی: دڵۆپو سوسپانسیۆن (تۆز).
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: زیادبوونی پاڵەپەستۆی ناو گوێی چاو.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ دڵۆپ لە گیراوە ٥/٠ یان سوسپانسیۆن ٢٥/٠دووجار لەڕۆژ بۆ ناو چاو.

بەکارنەهێنان: لە خوارەوە بوونی ژمارەی تریەکانی دڵ– شۆکی دڵ– ناڕێکی دڵ.

- زیانە لاوەکییەکان: هاتنە خوارەوەی فرمێسك، سووتانەوەی سووکی چاو، ناڕێکی دڵ، کەمبوونی ژمارەی تریەکانی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش: خۆپاراستن لە لێخوڕیو کارەکانی ڕێكو پێك.

## بتانکول
## BETHANECHOLCHLORIDE

-ناوی بازرگانی: urecholine

- گرووپی دەرمانی: بزوێنەری کۆئەندامی میز و هەرسکردن.
- گرووپی کیمیایی: کولینرژیك.
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ١٠ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC
- بەکارهێنان: میزگیران پاش نەشتەرگەری یان منداڵ بوون‌و لەناوچوونی توولی میزڵدان، ریفلاکس، گەڕانەوەی ترشیاتی گەدە بۆ سورێنچك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ٥٠ ملگم ٢ تا ٤ جار (لانی زۆر تا ١٢٠ ملگم لە ڕۆژدا).

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، دابەزینی پەڵپەستۆی خوێن، زیادبوونی ترپەکانی دڵ، سك ئێشە، سکچوون.

فێرکردنی نەخۆش: - لەکاتی تەنگەنەفەسی خێرا پزیشك ئاگادار بکەن.

- دەرمانەکە بە سکی بەتاڵ بەکاربهێنرێت.

## بتا هیستین BETAISTIN

- ناوی بازرگانی: Betaserc
- گرووپی دەرمانی: دژی سەرسووڕان
- گرووپی کیمیایی: گرووپی بتا هیستامینی.
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٨ ملگم
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: توێژینەوەی لەسەر نەکراوە.

بەکارهێنان: سەرسووڕان.

ڕێژەی بەکارهێنان: سەرەتا ٢ حەب لەڕێگای خۆراکی ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژدا پاشان ٢٤ تا ٤٨ ملگم لە ڕۆژدا

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر- نەخۆشی فئۆکرۆسیتۆم

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە- فەوتاوی پێست- هێڵنج.

پارێزگاریەکان: لە تەنگەنەفەسی‌و برینی گەدەدا بە وریایی بەکاربهێنرێت.

**برم هگزین کلراید**

**BROMHEXIN-HCL**

- ـوی بازرگانی: Bisolvon
- گرووپی دەرمانی: خلت هێنەر.
- گرووپی کیمیایی: ئێکسپکتورانت
- شێوەی دەرمان: حەبەکانی ٨ ملگم، ـرووب، ئەمپوولەکانی ٤ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

ـەکارهێنان: کۆکەکانی هاوڕێ لەگەڵ ـت وەکو تەنگەنەفەسی، برونشیت، ـرونشکتازی، سینوزیت.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب هەر ٦ ـ ٨ کاتژمێر لە ڕۆژدا.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، ئازارەکانی کۆئەندامی هەرسکردن.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگادارکردنی پزیشک لەکاتی کێشەکانی هەرسکردن وەکو برینی گەدە.

باشتروایە دەرمان پاش خواردن بەکاربهێنرێت.

**برومۆکریپتین BROMOCRIPTINE**

- ناوی بازرگانی: Parlodel
- گرووپی دەرمانی: بزوێنەری هێلکەدانان، مەهاری چوڕانی هۆرمۆنی گەشە.
- گرووپی کیمیایی: بەرهەمی ئالکالوئید ئارگوت.
- شێوەی دەرمان: حەبی ٢/٥ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: نەزۆکی ئافرەتان، دەرمانی یارمەتیدەری نەخۆشی پارکینسۆل، ڕێگرتن لە چۆڕانی شیر پاش منداڵ بوون. ئاکرومگالی، گالاکتۆرە لە پیاوانی تووشبوو بە زیادبوونی پرۆلاکتین.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٠/٥ یان ١ حەب بدرێتو هەر ٣ تا ٧ کاتژمێر ١ حەب بە ژەم دەرمانەکە زیاد بکرێت، هەڵبەت بەپێی بەکارهێنانو بەپێی خواستی پزیشك.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بە ئارگوت، نەخۆشی دڵ، سکپڕی.

● زیانــە لاوەکییــەکان: تاریـك بیــنین، لــووتگیران، سەرئێشــە، پەشـێوی، بــێ ئـۆقرەیی، خـەمۆکی، دووبارەبوونـەوەی میـزگیران، هێڵـنج، کـەمبوونی ئـارەزووی خواردن، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

پارێزگاریەکان: شیردان، نەخۆشی جگەرو گورچیلە، منداڵان.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمانەکـــــە لەگــــــەڵ خـــــۆراك بەکاربهێنرێت.

– ئافرەتانی بەکارهێنەری دەرمان دەبێ شێوازەکانی تر بۆ رێگرتن لەسکپڕی جگە لەحـەبی خـۆراکی، یـان شـێوازی چـاندن بەکاربهێنرێت.

## بکلۆمثازۆن BECLOETHAZONE

● ناوی بازرگانی: Beclovent

● گرووپـــی دەرمـــانی: کورتـــون، دژی هەوکردن، دژی تەنگەنەفەسی.

● گرووپی کیمیایی: کورتون.

● شێوەی دەرمان: سپرای دەمو لووت.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بـــەکارهێنان: تەنگەنەفەســـی، رینیـــت، هاتنــەخوارەوەی ئــاو لــە لــووت، وەرزی برونشیتی درێژخایەن.

رێژەی بەکار هێنان: لەتەنگە نەفەسییدا ٢ پاف ٣ تا ٤ جار لەرۆژدا لانی زۆر تا ٢٠ پاف لە رۆژدا.

بەکارنـــــــــەهێنان: هێرشـــــــــەکانی تەنگەنەفەسـی، ئـازارە باریکـەی چـالاك، منداڵانی خوارووی تەمەن ٣ ساڵ.

● زیانــە لاوەکییــەکان: وشــکی دەم، گریمانـــەی هـــەوکردنی کـــەرووی دەم، ســووتانەوەی دەم، خــوێن بــەربوون لــە لووت، هێڵنج.

فێرکردنی نەخۆش:

--گەر نەخۆش لە سپرای سالبونتامۆل
--ی- وەردەگرێ، پاش ئەم دەرمانە
--ی- ی لێ وەربگیرێ.
- ـش هەرجارێك سوود وەرگرتن دەمی
-- و بشوات.
- ـگداركردنەوەی پزیشك ئەگەر لە
--ودی ٣ هەفتە چاك نەبووەوەو
-ركردنی دەم روویدا.

**بلادۆنا- پی بی BELLADONNA-PB**

- ـوی بازرگانی: Donnatol
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی كولینرژیك
- گرووپی كیمیایی: پێكهاتەی بلادۆنا، -وسینو باربیتۆرات.
- شێوەی دەرمان: حەبو شرووب.

-ەكارهێنان: دەرمانی یارمەتیدەر لە چارەسەركردنی برینی گەدە، سوورپی -نگانەی دەردناك، هێڵنجو رشانەوەی -كپڕی، سكچوون.

ڕێژەی بەكارهێنان: پێگەیشتووان یەك تا ٢ حەب ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژدا یان ٥ تا ١٠ -ی سی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

بەكارنەهێنان: گیرانی بۆڕی هەرس، ئاوی ڕەش (گلوكوم).

-زیانە لاوەكییەكان: تاریك بینین، وشكی دەم، هێماكانی توورەبوونو كێشەكانی میزو میزەڕۆ.

پارێزگاریەكان: نارێكی دڵو نەخۆشی تیرۆئید.

فێركردنی نەخۆش:

دەرمانەكە نیو كاتژمێر بەر لەخواردنو شەوەكانی نووستن بەكار بهێنرێت.

خۆپاراستن لە لێخوڕیی لە كاتی تاریك بینین.

**بلادۆنا ئەرگۆتامین پی بی.**

**BELLADONNA ERGO TAMIN-PB**

ناوی بازرگانی:Rellergal

- گرووپی دەرمانی: دژی لا ژانەسەر (میگرن).
- گرووپی كیمیایی: پێكهاتەی بلادۆنا، ئەرگۆتامین و فتوباریتال.
- شێوەی دەرمانی: حەب

بەکارهێنان: پێشگیری لە لاژانەسەر، کەمکردنی زیانەکانی بەر لە سووڕی مانگانە، کەمکردنی هەندێك لەنیشانەکانی کاتی لەزان کەوتن.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆبەرگرتن لە ژانەسەرەکانی میگرنیو زیانەکانی مانگانە، ڕۆژانە چوار حەب بەکاربهێنرێت. لەهەندێ دۆخدا دەکرێ دەرمانەکە تا ٦ حەب زیادبکرێت، پاشان کەمبکرێت. خواردنی ٤ حەب بەم شێوەیە: حەبێك بەیانی، حەبێکی تر ئێوارە و دوو حەب بە شەو.

**بنزترۆپین مسیلات**

**BENZTROPINE MESYLATE**

- ناوی بازرگانی: Apo-Benztropine
- گرووپی دەرمانی : دژی پارکینسون.
- گرووپی کیمیایی : ئامین سێ دێرایشی
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانو ئەمپوولی ٣ ملگم.
- بەکارهێنانی لەسکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: پارکینسون، دیستونی (سفتو سۆڵی ماسوولکەکانی ملو ئەندامەکان).

ڕێژەی بەکارهێنان: ٠/٥ تا ١ ملگم یەکجار لەڕۆژ و هەروە تا ٦ ڕۆژ لەسەر بنەمای وەڵامدانەوەی نەخۆش٠/٥ ملگم زیاد دەکرێت (ژەمی کۆتایی لایەنی زۆر ٦ملگم)ە.

بەکارنەهێنان: بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی ناوچاو. منداڵەکانی خوارەوەی سێ ساڵ، بڕینی گەدە، گیرانی هەرسکردن، میاستنی گراویس.

- زیانەکانی لاوەکییەکان: لاوازی ماسوولکەیی، تاریك بینینو ترس لەڕووناکی، میزگیران، قەبزی، وشکی دەم، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی دەرمانەکانی هەڵامەتو ئەنتی

هیستامینەکان، جگە لەوکاتەی کە پزیشك بەباشی بزانێت.

- خۆپاراستن لەڕاگرتنی لەناکاوی دەرمان.

**بنزوکائین BENZOCAIN**

- ناوی بازرگانی: Americaine
- گرووپی دەرمانی: سڕکەری شوێن
- گرووپی کیمیایی: بەرهەمگەلی ئەسیدپارا ئامینۆبنزۆئیك (paba)
- شێوەی دەرمانی: مەرهەم
- بەکارهێنانی لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: سڕەوێنەری ژانەکانی شوێنیی وەکو برینەکانی سووك. ددان ئێشە، سووتان لەبەر خۆر، گەزتنی مێروولەکان، ژانی همورۆئید، خوران.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەڕێژەی پێویست لەسەرشوێنەکە بماڵدرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە مەودای بنزوکائین.

- زیانە لاوەکییەکان: خوران، لیر

پارێزگاریەکان: منداڵانی بچووکتر لە ٦ساڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

- بۆماوەیەکی درێژخایەن لەدەرمان سوود وەرنەگری. (کەمتر لەیەك هەفتە).

- خۆپاراستن لەماڵینی دەرمان لەچاو.

**نبزوئیلپراکساید**

**BENZOYL PEROXIDE**

- ناوی بازرگانی: Benzac
- گرووپی دەرمانی: دژی زیپکە
- گرووپی کیمیای: کراتۆلیستیك
- شێوەی دەرمانی: ژڵو لوسیۆن
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: زیپکە کەم تا مامناوەند ڕۆژانە ٢جار.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە بەرهەمگەلی نبزوئیل پراکساید، پێستی ڕووتو هەوکردوو.

- زیانە لاوەکییەکان: سووتانەوەی پێست، سووربوونی پێست، ئاوسانی پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە مالینی دەرمان لەجلوبەرگو قژ تا ڕەنگی نەبن.

– دەکرێ لەماوەدای ئارایشت لەسەر شوێنی مالینی دەرمان سوود وەربگرێ. گەرمی یان هەستێك لەسەر شوێنی مالینی دەرمان بەدیدێت.

**بنزیل بنزوات BENZYLBENZOAT**

● ناوی بازرگانی: Anusol

● گرووپی دەرمانی: دژی گرویتیو ئەسپێ.

● شێوەی دەرمانی: لۆسیۆن (نەرمکەر، کرێم).

● گرووپی کیمیایی: بەرهەمگەلی ئەسید بنزوئیك.

● بەکارهێنانی لەسکپڕیدا: گرووپی X

بەکارهێنان: بۆ گرویتی، لەناوبردنی ئەسپێی تووکی ژێرسكو ئەسپێی سەر.

ڕێژەی بەکارهێنان: چارەسەری نەخۆشی گرویتی دوای خۆشوشتن بە ئاوی گەرمو سابوون لە مل بۆ خوارەوە بەشێوەی ڕێك لێبدرێت، دوای وشك بوونی لای یەکەم ئەم کارە دووبارە بکەنەوە. دوو ڕۆژ لەسەر یەك ئەم کارە ئەنجام بدرێت بۆ پێگەیشتووان ۳۰سی سی بۆ منداڵان ۲۰ سی سی لە لۆسیۆن بەکاربهێنرێت. لە کاتی گەڕانەوەی نەخۆشی بەکارهێنانی دەرمان پاش ۷۰ تا ۱۰ ڕۆژ دەبێت دووبارە ببێتەوە. پاش کۆتایی بەکارهێنانی دەرمانەکە نەخۆش دەبێت بچێتە گەرماو و دەرمانەکە بشوات. چارەسەری پدیکۆلۆزی سەر، تووکی ژێرسك لە پێگەیشتووان، دەبێت لوسیۆن لەو شوێنەی کە مووی هەیە بماڵدرێتو پاش ۱۲ تا ۲٤ کاتژمێر بە ئاوو سابوون بشۆردرێت. دەکرێ ئەم کارە پاش هەفتەیەکی تر دووبارە بکرێتەوە.

● زیانە لاوەکییەکان: بەرکەوتنی ئەم دەرمانە لەگەڵ دەموچاو و توێکڵەکانی چڵمو ڕێڕەوی میز دەبێتە هۆی بەدیهاتنی هەوکردنو پەچەکرداری ئالرژیك.

فێرکردنی نەخۆش:

ـەخۆش دەبێت گشت جلو بەرگو ـرستەی نووستنی خۆی بە ئاوی گەرم ـوات و لەشوێنی گەرم بۆ ماوەی ٢٠ ـەك وشك بكاتەوە.( بۆ نموونە بە ـتوو).

ـودوەرگرتنی پێشگیرانە لەدەرمان بۆ ـسانی تری خێزان، كە لەگەڵ نەخۆش ـ پەیوەندیدان زۆر بەسوودە.

## بوپرنۆرفین BUPRENORPHIN

- ناوی بازرگانی: Buprenex
- گرووپی دەرمانی: دژی ئێش سڕكەر
- گرووپی كیمیای: ئپسیوئید
- شێوەی دەرمانی: حەبو ئەمپوول
- بەكارهێنان لەسكپڕیدا: گرووپیC

بەكارهێنان: ژانی مامناوەند تا توند، ژانی بەدیهاتوو لە شێرپەنجە.

- ڕێژەی بەكارهێنان: بەپێی خواستی پزیشك.
- زیانە لاوەكییەكان: خەوالوویی، سەرسووڕان، سەرئێشە، هێڵنج، ڕشانەوە، سووتانەوەی ڕێڕەوی میز- لیر، وزەوزی گوێ، تاریك بینین.

## بوپرۆپیۆن BUPROPION

- ناوی بازرگانی: Wellbutrin
- گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆكی
- گرووپی كیمیایی: ئامینۆكتۆن
- شێوەی دەرمانی: حەبەكانی ١٠٠،٧٥ ، ١٥٠ ملگم.
- بەكارهێنان لەسكپڕیدا: گرووپیB

بەكارهێنان: خەمۆكی، وازهێنان لەجگەرە.

ڕێژەی بەكارهێنان: بە ٥٠ ملگم دەست پێدەكات و لە هەرسێ ڕۆژ دەتوانرێ ٥٠ ملگم زیاد بكرێت.

بەكارنەهێنان: شڵەژاوی.

- زیانە لاوەكییەكان: بەرزبوونەوە یان دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، خوران، تاو لەرز، سەرئێشە، زیادبوونی ترپەكانی دڵ. تاریك بینین، لاوازی، ناهاوسەنگی لەبیستندا.

پارێزگاریەکان: نەخۆشی دڵ. نارێکی دڵو گورچیلەو جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– راگرتنی دەرمان مەترسیدارە.

– دەرمان لە کاتژمێرەکانی دیاریکراو بەکاربهێنرێت.

– گریمانەی سەرهەڵدانی ناتوانایی سێکسی لە ئارادایە.

– لەگەڵ زیادکردنی ڕێژەی بەکارهێنانی دەرمان گریمانەی شلەژاوی لە ئارادایە

**بۆتولینۆم ئۆکسین – ئا BOTULINOMTOXIN- A**

- ناوی بازرگانی: -Botox Dysport
- گرووپی دەرمانی: شلکەری ماسوولکەیی.
- گرووپی کیمیایی: نوروتۆکسین
- شێوەی دەرمانی: ڤیال
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: خێلی چاو، پشت ئێشە، ئیفلیجی مێشك.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، میاستنی گراویس.

- زیانە لاوەکییەکان: شل بوونەوەی توندی ماسوولکە، هاتنە خوارەوەی فرمێسك، ترس لە ڕووناکی، وشکیو برینی ڕەشکێنە.

**بوسپیرۆن کلراید BUSPIRON HCL**

- ناوی بازرگانی: Buspar
- گرووپی دەرمانی: دژی پەشێوی.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۱ ، ۲، ۵ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: پەشێویو هاندان

- ڕێژەی بەکارهێنان: بە ۱۵؛ ملگم دەست پێدەکرێتو هەرسێ ڕۆژ ۰۱۵ ملگم زیاد دەکرێت.
- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سەرئێشە، وشکبوونی دەم، سکچوون، سەرسووڕان.

ـیرکردنی نەخۆش:
-ـ دەرمان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.
خۆپاراستن لە ڕاگرتنی لەناکاو ـەکارهێنانی دەرمان.
خۆپاراستن لە لێخوڕی سەیارەو کارە ـیـەکان.

**بیزاکودیل** BISACODYL

- ناوی بازرگانی: Biscolax
- گرووپی دەرمانی: نەرمکەر
- گرووپی کیمیایی: بەرهەمگەلی دی فنیل متان.
- شێوەی دەرمانی: حەبو فنیل ٥و ١٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: چارەسەری کورتخایەنی قەبزی ئامادەکردنی ڕیخۆڵە بەر لە نەشتەرگەری‌و بەمەبەستی پشکنینی (کولونۆسکۆپی).
ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب یان فنیل.

بەکارنەهێنان: هێڵنجو ڕشانەوە، کێشەکانی سك. قەڵشاوی کۆم، هپاتیت (هەوکردنی جەرگ).

- زیانە لاوەکییەکان: لاوازی ماسوولکەیی، هێڵنج، کەم بوونی ئارەزووی خواردن، کەم بوونی پۆتاسیۆم، سکچوون، سووتانەوەی دەوروبەری کۆم.

فێرکردنی نەخۆش:
– بەهۆی لەناوچوونی تۆنی ڕیخۆڵە بۆ ماوەیەکی درێژ بەکارنەهێنرێت.
– باشتروایە لە شلەمەنی خواردەمەنی فیبردار سوود وەربگیرێت.

## بیسموت ساب سیتران
## BISMUTHSUBCITRATE

- ناوی بازرگانی: Pepto- Bismol
- گرووپی دەرمانی: دژی برینی پیتیک، دژی سکچوون.
- گرووپی کیمیای: پێکهاتەی بیسموت
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٢٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی D

بەکارهێنان: چارەسەری برینی گەدەو دوازدەگرێ بەدیهاتوو لە هلیکو باکترپیلۆری، بەرگرتنو چارەسەری سکچوونی سەفەر، بەد هەرسکردن.

ڕێژەی بەکارهێنان: یەك حەب هەر ٦ کاتژمێر.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بەدەرمان.

- زیانە لاوەکییەکان: ڕەشایی زمان، ڕەشایی پاشەڕۆ، پاشەڕۆی سفتو گوشراو، تامی کانزا لەدەمدا، ڕەشو شین بوونی پوو.

پارێزگارییەکان: بەکارهێنانی زیاتر لە ٢ ڕۆژ لە تای بەرز لە منداڵانی بچووکتر لە ٣ ساڵ.

فێرکردنی نەخۆش: وەکو بەرگرتن نابێ لە ٣ هەفتە بەکاربهێنرێت.

# C

## CABERGOLIN کابرگولین

- ناوی بازرگانی: Dostinex
- گرووپی دەرمانی: ڕاگیرکەری چۆڕانی پرۆلاکتین
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٠\٥ و ١ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: لە دۆخی زیادکردنی چۆڕانی پرۆلاکتین‌و نەخۆشی پارکینسۆل.

ڕێژەی بەکارهێنان: بە ٠\٢٥ ملگم ٢جار لەهەفتەدا دەست پێ دەکرێ‌و پاشان ٠\٢٥ ملگم لەماوەی ٢ هەفتە زیاد دەکرێت.

بەکارنەهێنان: ژەهراوی سکپڕی، شیردان.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سەرسووڕان، بێ ئۆقرەیی، بێ خەوی، پەشێوی، دابەزینی پاڵاپەستۆی خوێن، ژانی مەمك، خۆتێ هەڵقورتانی دەرمان.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەکارهێنانی دەرمان دەبێ تا ٦مانگ پاش سروشتی بوونی ڕێژەی هۆرمۆنی پرۆلاکتین درێژەی هەبێ.

ئەندازەگیریکردنی کاریگەری دەرمان.

## CAFFINE کافئین

- ناوی بازرگانی: vinuphos
- گرووپی دەرمانی: بزوێنەری سووکی کۆئەندامی دەمار.
- شێوەی دەرمانی: پێکهاتە لەگەڵ A.C.A ئاکسار.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیD

بەکارهێنان: زیادکردنی وشیاری. خێراکردنی کارکردی ماسوولکەکان، زیادکردنی کاریگەری دژی ئێشی ئەسپیرین‌و ئستامینۆفن.

ڕێژەی بەکارهێنان: لەA.C.A باسکراوە

● زیانە لاوەکییەکان: بێخەوی، سەرئێشە، شڵەژاوی، وزەوزی گوێ، هێڵنج.

● پارێزگارییەکان: لەدۆخەکانی بڕینی گەدە بەوریایی بەکاربهێنرێت.

## کالامین CALAMINE

● ناوی بازرگانی: Calamox

● گرووپی دەرمانی: دژی خوران

● شێوەی دەرمانی: لوسیۆن (نەرمکەر)و کرێمی شوێنی(٨٪)

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیA

بەکارهێنان: لیر، هەوکردنەکانی بەدی هاتوو لە سووتان لەبەر خۆر، درماتووزەکان وەکو ئەگزیماو شوێنی گەستنی مێرولەکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٣ جار لە ڕۆژدا

● زیانە لاوەکییەکان: زیانی تایبەتی نییە.

فێرکردنی بیمار:

– ئەم دەرمانە لە ڕێگای پێست هەڵنامژێ.

– خۆپاراستن لە پەیوەندی دەرمانەکە لەگەڵ چاو و کۆئەندامی زاوزێی ئافرەتان.

## کالسیپوتریول CALCIPOTRIOL

● ناوی بازرگانی: Dovonex

● گرووپی دەرمانی: دژی پسوریازیس

● شێوەی دەرمانی: مەلهەم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

● بەکارهێنان: چارەسەری پسوریازیس.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢ جار لە ڕۆژداو هەرجارە لایەکی ناسك مەلحەمەکە لەسەر شوێنەکە بماڵدرێت.

بەکارنەهێنان: بەرزبوونەوەی کالسیۆمی خوێن، ژاراوی بوون بە ڤیتامین D

● زیانە لاوەکییەکان: کالسیۆمی خوێن، هەوکردن، هەستیاری.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستنی نەخۆش لە پەیوەندی ...ردن لەگەڵ پێستی دەم و چاو.
- ئاگادارکردنەوەی پزیشک ئەگەر ...ماوەی ٨ مانگ چاکبوونەوە ...نەهات.

**کالسی تونین** CALITONIN

- ناوی بازرگانی: Salmon
- گرووپی دەرمانی: دژی پووکاوی ...وونی ئێسک، فاکتۆری پارائیدی.
- شێوەی دەرمانی: سپرای لووت
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: پووکاوی بوونی ئێسک پاش ...ژان کەوتن، دۆخەکانی سەقامگیربوونی ...وەکو دۆزینەوەو چارەسەرکردنی ...شێرپەنجەی غودەدە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٤ یەکە بۆ هەر کیلۆگرام ماسوولکەیی، یان ژێر پێست هەر ١٢ کاتژمێر و لەکاتی پێویست بۆ ٨ یەکە بۆ هەر کیلۆگرام لە ٦ کاتژمێر زیادبکرێت، (لەچارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی کالسیۆمی خوێن). لە چارەسەرکردنی پووکی ئێسک بەدیهاتوو لە لەزانکەوتن ڕۆژانە ١٠٠ یەکە.

- زیانە لاوەکییەکان: ئاوسانی پەنجەکان، سەرئێشە، لەرز و لاوازیو سەرسووڕان، هێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، تەنگەنەفەسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشتر وایە بەشەو پێش نووستن بەکاربهێنرێت.
- خواردەمەنی فیبردار بەکاربهێنرێت.
- سوودوەرگرتن لە سپرای لووتو هەر ڕۆژ لەکونە لووتێکدا.
- هێمایەکانی هەرسکردن، زیادبوونی میز. ئاوسانی سەر، هەستکردن بەسووتانەوەو سەر ئێشە لەوانەیە بەیانکەری زیادبوونی کالیسیۆمی خوێن بێت.

## CALCITRIOL کالسی تریول

● ناوی بازرگانی:
Calcifex. Recattrol
●گرووپی دەرمانی: ئانالۆگ ڤیتامین D
● شێوەی دەرمانی: دەرزیەکانی ۰\۲۵ میگرۆگرام
● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC
بەکارهێنان: چارەسەری کەمی کالسیۆم بەتایبەت ئەو نەخۆشانەی کە لەژێر دیالیزدان. چارەسەری کەمی هۆرمۆنی پاراتیرۆئید و نەخۆشی ئێسکەنەرمە.
ڕێژەی بەکارهێنان: ۰\۲۵ میکرۆگرام (یەك حەب) لە ڕۆژدا زیاد بکرێ.
بەکارنەهێنان: بەرزبوونی ڕێژەی کالسیۆمو فوسفوری خوێن، ژەهراوی بوون بە ڤیتامینD
● زیانە لاوەکییەکان:
خەوالّوویی، سەرئێشە، هێڵنج، سکچوون، وشکبوونی دەم، ژانی جومگە. زیادبوونی میز، زیادبوونی کالیسیۆم، هەبوونی خوێن لە میزدا، تاو لەشگرانی.

فێرکردنی نەخۆش:
– ئاگادارکردنەوەی پزیشك لەکات سەرهەڵدانی هێمایەکانی نەخۆشی دڵ.
– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی مەواد سۆدیۆمدا (بەروبوومی شیرەمەنی زەیتون، چەوەندەر، سرکە).
– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی مەواد پۆتاسیۆمدار (پرتەقاڵ، مۆز، میوە وشککراو، نیسك، گەڵای سەون سەوزەکان، شیر، گندۆرە، پاقلە.

## کربناتکالسیۆم CALCIUM CARBONATE

● ناوی بازرگانی: Caltrate
● گرووپی دەرمانی: بەروبووم پارمەتیدەر و کالسیۆمدار– ئەنتی ئەسید
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۰۰ ملگم.
●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C
بەکارهێنان: چارەسەری بەرزبوون فسفۆر لە نارێکی گورچیلە، کەمبوون

بەکارهێنان: کەم کارکردنی پاراتیرۆئید بەرگرتن لەکاریگەرییەکانی بەرزبوونی کالسیۆم لەسەر دڵ ژاربەری سۆلفات مەگنسیۆم، چارەسەری کەمبوونی کالسیۆم.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ چارەسەرکردنی کەمبوونی کالسیۆم. ئەمپوولێك بە شێوەی هێواش لەدەمار بدرێت، خێرایی لێدانی ئەمپوولەکانی نابێ زیاتر لە (٥)مل لیتر لە خولەکێك دابێت.

بەکارنەهێنان: نەخۆشی متاستاتیکی ئێسك، زۆر کارکردنی پاراتیرۆئید، بەردی گورچیلە.

● زیانە لاوەکییەکان:

هەستکردن بەگەرم بوون لەکاتی دەرزی لێدانی خێرای دەماری، هێواش بوونی تریەکانی دڵ، دابەزینی پالاپەستۆی خوێن و ڕاوەستانی دڵ لەوانەیە ڕووبدات.

● پارێزگارییەکان: نارێکی دڵ، نارێکی گورچیلە، سارکوئیدوز، نەخۆشیەکانی بێ جوولە.

فێرکردنی نەخۆش:

- دەرزیەکە نابێت بەشێوەی ماسوولکەیی و ژێرپێست لێبدرێت.

- بەکارهێنانی کەرستەی خۆراکی کە توخمی کیمیایی (روی) فراوانی تێدایە، وەکو گوێزو فندق و هەندێك سەوزە کە دەبێتە هۆی کەمبوونی هەڵمژینی کالسیۆم.

## کالسیۆم پانتوتنات

## CALCIUM PANTHO TENATE

● ناوی بازرگانی: Pantenil

● گرووپی دەرمانی: ڤیتامین B (B5)

● شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠٠ملگم

● بەکارهێنان لەسکرپیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: بەرگرتن و چارەسەری کەمبوونی ئەم ڤیتامینە بۆ نموونە لە نەخۆشی سلیاك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٥ تا ١٥ ملگم

● زیانە لاوەکییەکان: نیەتی

کالسیۆم، وەکو ئەنتی ئەسید لەبرینی گەدەدا.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١گرام ٤ تا ٦ جار

بەکارنەهێنان: بەرزبوونی کالسیۆم، پاراتیرۆید تۆمۆرەکانی ئێسك.

- زیانە لاوەکییەکان:

قەبزی، کەم بوونی ئارەزووی خواردن، هێڵنج، خوێن بەربوون، پاڵەپەستۆی خوێن، زیاد بوونی کالسیۆم، بەردی گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– وەکو ئەنتی ئەسید یەك کاتژمێر بەر لە خواردن بەکاربهێنرێت.

– بەکارهێنانی شلەمەنیەکان تا ٢ لیتر زیاد بکەن جگە لەو کاتەی کە خواردنە شلەمەنیەکانی لێ قەدەغەکراوە.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەکاتی زیادبوونی کالسیۆم وەکو وشکی دەمو تێنوێتی.

## کالسیۆم – د CALCIUM- D

- گرووپی دەرمانی: تەواوکەرەوو دابینکەری کالسیۆمو ڤیتامین D
- شێوەی دەرمانی: حەبی ٥٠٠ ملگم کالسیۆم کاربۆنات + ٢٠٠٠یەکەی ڤیتامین D.

## کالسیۆمفورت CALCIUMFORTE

- گرووپی دەرمانی: دابینکەری کالسیۆمی لەش.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٣\٠گم کربنات کالسیۆمو ٢\٩٤گم (بۆزانیاری زیاتر سەیری کالسیۆم کربنات بکەن)

## کالسیۆم گلوکۆنات CALCIUM GLUCONATE

- ناوی بازرگانی: Kalcinate
- گرووپی دەرمانی: دابینکەری کالسیۆم
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی لەسەدا دە لە ١٠ سی سی.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

فێرکردنی نەخۆش: - نەتوانێ جێگرەوەی کالسیۆم بێت، چونکە کالسیۆمێکی بەرزی نیە.

**کاپریۆمایسین CAPREOMYCIN**

● ناوی بازرگانی: Capastat

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك دژی دەردەباریکە (سیل).

●شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ١گم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان: چارەسەری سیلی یسپەلاکی ئەگەر بەرگەی ئیزۆنیازیدو ریفامپین نەگیرێت.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك

● زیانە لاوەکییەکان: هەستاری بەپرووناکی، وزەوزی گوێ، کەمبوونی کارکردنی گورچیلە.

پارێزگاریەکان: لە نەخۆشی گورچیلەو جگەر میاستنی گراویس.

فێرکردنی نەخۆش:

- سەردانی پزیشك کردن لەو کاتەی کە کەمبوونی بیستن ڕوویدات.

- تاقیکردنەوەکانی جگەرو گورچیلە پێش و پاش و لەکاتی چارەسەریدا دەبێت کۆنترۆڵ بکرێت.

**کاپتوپریل CAPTOPRIL**

● ناوی بازرگانی: Capoten

● گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و ٥٠ ملگم.

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: بەرزبوونی پاڵەپەستۆی خوێن، ناڕێکی دڵ، بەرگرتن لە ئاسیو، گەیشتن بە گورچیلە لەکاتی نەخۆشی شەکرە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٢\٥ مل گرم ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژدا کە نزیکەی ٥٠ ملگم ٢ تا ٣ ڕۆژ، لانی زۆر تا ٤٥٠ ملگم لەڕۆژدا لە کرۆنترۆلکردنی پاڵەپەستۆی خوێن

دەکرێ ٢٥ تا ٥٠ ملگم لەدەرمان بەشێوەی ژێرزمان سوودی لێوەربگیرێت.

بەکارنەهێنان: شیردان، بەرزبونی ڕێژەی پۆتاسیۆم.

● زیانە لاوەکییەکان: دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ناتوانایی سێکسی، زیادبوونی پۆتاسیۆم و کەمبوونی سۆدیۆم، ناهاوسەنگی لەهەستی تامکردن، کۆکەکانی وشك.

فێرکردنی نەخۆش:

– سوود وەرگرتن لەدەرمانی یەك کاتژمێر بەر لەخواردن.

– بۆ ئاگاداربوون لە کاریگەری دەرمانەکە ٢ هەفتە کات پێویستە.

– لەکاتی ئاوسانی قورگ و دەست و پێ و فەوتانی پێست سەردانی پزیشك بکەن.

– کەمبوونی هەستی تامکردن لە سەدا پێنج تا ١٠ بەشێوەیەکی ئاسایی لەماوەی ٢ تا ٣ مانگ تەنانەت (سەرەڕای بەکارهێنان) لادەبردرێت.

## کاربامازپین CARBAMAZPIN

● ناوی بازرگانی: Tegretol

● گرووپی دەرمانی: دژی شڵەژاوی

● شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٠٠و ٤٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: شڵەژاوی، ناهاوسەنگیەکانی دەروونی وەکو مانیا و ئسکیزوفۆنی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا حەب ٢جار لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە دژی خەمۆکیەکان کاربا مازپین، ناڕێکی مۆخی ئێسك.

● زیانە لاوەکییەکان: کەبوونی خڕۆکە سپیەکان، خەوالوویی، سەرسووڕان، هێڵنج، برین و هەوکردنی دەم و زمان، سندرم ستیوم جانسۆن. خراپتربوونی نەخۆشیەکانی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش: – بۆکەمکردنی هێماکانی هەرسکردن لەگەڵ شیر یا خواردەمەنی بەکاربهێنرێ.

– ئەوکاتی کە دەم وشك بوو لە نەبات، شوشتنی دەم‌و بنیشت سوود وەربگرێت.

–بەهۆی مەترسی بەدیهێنانی شلەژاوی لە بەکارهێنانی ئەلکهول – خۆتان بپارێزێن.

– پاش بەکارهێنانی ماوەیەکی درێژ لە ڕاگرتنی لەناکاوی دەرمان خۆتان بپارێزن.

– میزی نەخۆش لەوانەیە ڕەنگێکی بۆ پەمەیی یان قاوەیی بگۆڕدرێت.

## کارنیتین CARNITINE

- ناوی بازرگانی: Vitcarn

گرووپی دەرمانی: تەواوکەری خواردەمەنی.

- شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٥٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: کەمبوونی کارنیتین لە بەرنامەکانی لەشجوانی (بەهێزکردنی ماسوولکەکان).

ڕێژەی بەکارهێنان: ١حەب ڕۆژانە ٢ تا ٣ جار.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوون، گۆڕینی بۆنی لەش.

فێرکردنی نەخۆش:

باشتروایە نەخۆش دەرمانەکە بەمەودای هەر ٣تا٤ کاتژمێر بەکاربهێنرێت.

## ڕونی گەرچەك CASTOR OIL

- ناوی بازرگانی: Neoloid
- گرووپی دەرمانی: نەرمکەر
- شێوەی دەرمانی: ڕونBuik

بەکارهێنان: ئامادەکردنی ڕیخۆڵە بۆ نەشتەرگەری.

ڕێژەی بەکارهێنان: خۆراکی ١٥تا٦٠ سی سی بە شێوەی ١٦ کاتژمێر بەرلە ئەنجامدانی هەرکارێکی پزیشکی.

بەکارنەهێنان: کۆبوونەوەو سفت‌و سۆل بوونی پاشەڕۆ، خوێن بەربوون لە کۆئەندامی هەرس، شیردان، ژانەسك،

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوون، تێکچوونی هاوسەنگی ئەلکترۆلیتەکان‌و شلەمەنیەکان.

● فێرکردنی نەخۆش:

– بۆمەبەستی هەڵمژینی باشتری دەرمان نزیکەی یەك کاتژمێر پێش‌وپاش لە بەکارهێنانی دەرمانەکە لەبەکارهێنانی دەرمانەکانیتر، ئەنتی ئەسیدەکان، شیر یان سایمتیدین خۆتان بپارێزن.

## CEFAZOLIN ODIUM سفازولین

● ناوی بازرگانی: Kefzol،Ancef

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ٢٥٠و ٥٠٠ ملگم.

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: هەوکردن لەبەشەکانی جۆراوجۆری لەش.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی توندی نەخۆشیەکە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرێشە، سەرسووڕان، کەمبونی خانەکانی خوێن، لیر، زیادبوونی ئاتیریمەکانی جگەرو زیانی گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش: خۆپاراستن لەبەکارهێنانی ئەلکهول، یان بەکارهێنانی هاوکاتی ئەلکهول‌و دەرمانەکان.

## CEFIXIME سفیکسیم

● ناوی بازرگانی: Suprax

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٠٠و ٤٠٠ ملگم شەربەتی ١٠٠ ملگم

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: چارەسەر هەوکردنی میزەڕۆ. گوێی ناوەندو قوڕگ، برونشیت سەخت، سۆزاك.

● ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٠٠ ملگم و ٢جار لەڕۆژدا یان ٤٠٠ ملگم ڕۆژانە.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند بە سفالو سپورینەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج سکچوون، بای سك، گورچیلە، جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– ڕاگرتنو بەکارنەهێنانی دەرمان لەکاتی شلەژاوی.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەهەر چەشنە سکچوونێك.

## سفوتاکسیم CEFOTUXIME

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك، سفالوسپۆرین وەچەی سێیەم.

●شێوەی دەرمانی: ڤیال ٥٠٠ملگم.

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: هەوکردنی بەشەکانی جۆراو جۆری لەش.

● ڕێژەی بەکارهێنان: ماسوولکەیی یان دەماری ١ تا ٢ گم هەر ١٢– ٨ کاتژمێر لانی زۆر ١٢ گم لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند نسبەت بە سفالوسپۆرینەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچوون، بای سك، زیانە جگەرو گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگادارکرنی پزیشك لەو کاتەی کە قورگ ئێشا. ڕەشو شین بوون، خوێن بەربوون، ژانە جومگە ڕوویدات، چونکە لەوانەیە نیشاندەری ناهاوسەنگییەکانی خوێن بەربوون بێت.

## سفتازیدیم CEFTAZIDIME

● ناوی بازرگانی: Fortum

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك، سفالوسپورین، وەچەی سێیەم.

● شێوەی دەرمانی: ڤیال ٢٥٠ و ١٥٠

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان: هەوکردنی بەشەکانی جۆراوجۆری لەش.

ڕێژەی بەکارهێنان: ماسوولکەیی یان دەماری ١ تا ٢گم هەر ١٢–٨ کاتژمێر لایەنی زۆر تا ١٢گم لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، نسبەت بە سفالوسپۆرین.

●زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچوون، بای سك، زیانە جگەر و گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لەو کاتانەی کە قورگ ئێشا. ڕەش و شین بوون، خوێن بەربوون، ژانە جومگە ڕوویدا، چونکە لەوانەیە پێشاندەری ناهاوسەنگییەکانی خوێن بەربوون بێت.

## سفتی زوکسیم CEFTIZOXIME

- ناوی بازرگانی: Cefizox
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك، سفالوسپورین، وەچەی سێیەم
- شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ٥٠٠ ملگم و ١گم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: هەوکردنی بەشەکانی جۆراوجۆری لەش.

ڕێژەی بەکارهێنان: ماسوولکەیی یان دەماری ١ تا ٢ گم هەر ١٢ – ٨ کاتژمێر، لانی زۆر تا ١٢ گم لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند نسبەت بە سفالوسپۆرینەکان.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچوون، بای سك، زیانە جگەر و گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگادارکردنی پزیشك، لەوکاتانەی کە قورگ ئێشە، ڕەش و شین بوون، خوێن بەربوون، ژانی جومگە ڕوویدات، چونکە لەوانەیە پێشاندەری ناهاوسەنگیەکانی خوێن بەربوون.

## سفترياكسون CEFTRIAXONE

- ناوی بازرگانی: Rocephin
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك، سفالوسپۆرین، وەچەی سێیەم
- شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ٢٥٠ تا ٥٠٠ ملگم و ١ گرام.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: هەوکردنی بەشەکانی جۆراوجۆری لەش.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ گم هەر ١٢ کاتژمێر لانی زۆر تا ٤ گم. لە هەوکردنی سۆزەنەك لێدانی دەرزی یەکجار ١٢٥،

٢٥٠ ملگم هـاورێ لەگـەڵ بـەکارهێنانی ٧ ڕۆژ داکسی سایکلین.

● زیانە لاوەکییەکان: زەرداو، کەمبوونی خانەکانی خوێن، کولیستی بەدیهاتوو لە ئەنتی بیوتیکەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگـاداركردنی پزیشـك لـە هەرچەشـنە سکچوونێك یان شلبوونی پاشەڕۆ.

لێدانی دەرزی بەشێوەی ماسوولکەیی زۆر بە ئێشە.

## سفالکسین CEPHALEXIM

● ناوی بازرگانی: Keflex

● گرووپـی دەرمـانی: ئـەنتی بیوتیـك، سفالوسپورین، وەچەی سێیەم.

● شـێوەی دەرمـانی: کەپسـوولەکانی ٢٥٠و ٥٠٠ ملگم شەربەتی ١٢٥و ٢٥٠ ملگم

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی B

بـەکارهێنان: هەوکردنـەکانی پێسـتو هەناسـە، گـوێی ناوەنـدو میـزەڕۆ، کۆئەندامی زاوزێ.

ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان ٢٥٠ تـا ٥٠٠ ملگم هەر ٦ کاتژمێر – منداڵان ٢٠ تـا ٥٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگم لەش لـە ٤ ژەمـی یەکساندا.

زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، سەرسووڕان، هێڵنج، کەمبوونی خانەکانی خوێن، لیر، زیانە گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– لـە ماسـت یـان خامـە بەمەبەسـتی بـەدیهاتنی فلـورمیکرۆبی ڕیخۆڵـە سـوود وەربگـیرێ تـا ببنـە هـۆی کـەمبوونی سکچوون.

– ئاگـاداركردنی پزیشـك لەهـەر چەشـنە سکچوونی توند.

## سفالوتین CEPHALOTHIN

● ناوی بازرگانی: Keflin

● گرووپـی دەرمـانی: ئـەنتی بیوتیـك، سفالوسپۆرین، وەچەی یەکەم.

● شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ١گرام

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بــــەکارهێنان: هـــەوکردنی بەشــــەکانی جۆراوجۆری لەش.

● ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان ٥٠٠ ملگم تـا یـەك گـم هـەر ٤ تـا ٦ کاتـژمێر، منداڵان ٢٠ تا ٤٠ ملگم.

● زیانـــە لاوەکییــەکان: سەرئێشـــــە، سەرســووڕان، هێڵــنج، کــەم بــوونی خانەکانی لەش، لیر، زیانە گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– لــە ماســت یــان خامــە بەمەبەســتی بــەدیهاتنی فلــورمیکرۆبی ڕیخۆڵــە ســوود وەربگــیرێ، تابێتــە هــۆی کــەمبوونی سکچوون.

– ئاگادارکردنــەوەی پزیشــك لــە هــەر چەشنە سکچوونێکی توند.

## ستریمید– سی C-CETRIMIDE

● ناوی بازرگانی: Cetravlon

● گرووپی دەرمانی: پاککەرەوە

● شێوەی دەرمانی: گیراوە

●بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX

بەکارهێنان: پاککردنەوەی سووتانەکانو زیانـــــەکانی ســـــەرەوەی پێســـــت، پاککەرەوەی پێست بەر لەنەشتەرگەری، پاککــەرەوەی دەســـتی پزیشـــکەکانو ئامێرەکانی نەشتەرگەری.

ڕێژەی بەکارهێنان: بە ڕێژەیەکی باش بۆ پاککردنەوەی برینەکان.

بەکارنەهێنان:

● زیانـــــە لاوەکییــــەکان: لــــەکاتی ســـوودوەرگرتن بــۆ شــوێنێك بەخەســتی دەبێتە هۆی ورووژاندنی پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراســتن لــە پەیوەنــدی گیراوەکــە لەگەڵ دەمو زمانو کونە لووتەکان

– خواردنــەوەی ئــەم گیراوەیــە دەبێتــە هۆی ژەهراوی بوونێکی توند.

## شـــــارکول چـــــالاك CHARCOAL ACTIVATE

- ناوی بازرگانی: Charcocaps
- گرووپی دەرمانی: خەڵووزی ئەکتیف
- شێوەی دەرمانی: حەبو گیراوەو تۆز
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیA

بەکارهێنان: چارەسـەری خێـرا لـە ژاراوی بـوون بـە دەرمـانو مـەودای کیمیـایی، دیالیزی گەدە. هەڵمژینی غازی ڕیخۆڵە لە بەدخۆراکیو کەمکردنی بای سك.

ڕێژەی بەکارهێنان: لابردنی سەم لەگەدەو ڕیخۆڵە دا ١ تا ٢گم بۆ هەر کیلۆگم کێشـی لەش.

بەکارنـەهێنان: کـاتی ژەهـراوی بـوون بـە مـەودای قلیـالیو ئەسـیدی، ئـەتانولو متـانول، هیدروکربتـەکانو سـیانیدەکان سـوودوەرگرتن لــەم دەرمانــە هــیچ یارمـەتییێکی ناکـات، لەمنـدالآنی تەمـەن خوارەوەی سێ ساڵ بەکار نەهێنرێت.

زیانە لاوەکییـەکان: ڕشـانەوەو زگچـوونو قـەبزیو گریمانـەی کـون بـوونی ڕیخۆڵـە لەبەکارهێنانی بێ ڕەوانکەر.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشـتر وایـە دەرمانەکـە لـەماوەی سـی خولەك ژارانگەزی بەکار بهێنرێت.
- خەڵووزی ئـەکتیف لەگـەڵ ئـاوی میـوە یان شەربەت بەکاربهێنرێت.

## هەلامەتی منداڵ CHILDRENCOLD

- گرووپی دەرمانی: دژی تاو و دژی ژان
- شێوەی دەرمانی: حەبـەکانی هـەڵگری ٨٠ ملگـــم ئەســـتامینوفن ١مـــل گـــرام کلرفنیرئـــــامین ٦\٢٥ملگـــــم فنیـــــل پرۆپانۆلامین
- بەکارهێنان: کەمکردنـەوەی هێماکـانی هەلامەت لەمنداڵەکاندا.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ١ تـا ٢ حـەب هـەر چوار کاتژمێر.

بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری ئـــەنتی هستامین، تەنگەنەفەسی، نەخۆشی دڵو باڵەپەستۆی خوێن.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، بێ ئـــۆقرەیی، سەرســـووڕان، قـــەبزی، سکچوون، لاوازی گشتی.

فێرکردنی نەخۆش: بەکارهێنانی دەرمان لەوانەیە ببێتەهۆی خەواڵوویی.

## کلرالهیدرات HYDRATE CHLORAL

● ناوی بازرگانی: Noctec

● گرووپـی دەرمـانی: ئـارام بـەخش، خەوهێنەر.

● شـێوەی دەرمـانی: شـەربەتەکانی ٢٥٠ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

● بـەکارهێنان: بـەدیهێنانی ئـارامی، چارەسەری بێ خەوی، بۆکۆنترۆڵی ئێش دوای نەشتەرگەری هاوڕێ لەگەڵ مادده سڕکەرەکان. ئارامکەرەوەی منداڵاکان بۆ ئەنجامدانی هێڵکاری مێشك.

ڕێژەی بەکارهێنان: لەپێگەیشتووان ٢٥٠ ملگم سێ جار لە ڕۆژدا، لە منداڵاکان ٨ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش لە ڕۆژدا لانی زۆر تا ٥٠٠ ملگم سێ جار لە ڕۆژدا.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، سکچـــوون، هێڵـــنج، لـــێر، دابـــەزینی باڵەپەستۆی خوێن

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لەبەکارهێنانی ئەلکهول و دەرمانەکە لە یەك کاتدا.

- ئـــەمڕۆ ئـــەم دەرمانـــە لەلایـــەن هەڵیســـێنەکان بـــۆ بێهـــۆش کردنـــی تاکاکەکان سوودی لێ وەردەگرێ.

## HLORAMPHENICOLکلۆرامفنیکل

- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك
- شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٢٥٠ ملگم، شەربەتەکانی ١٥٠ ملگم، ڤیالەکانی ١گم و دڵۆپەکانی چاو.
- بەکارهێنان: هەوکردنی توندی پەردەی دەماغ، چارەسەری نەخۆشی تیفوئید، دوومەڵەکانی دەماغ.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش لە ٤ ژەمی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: نەخۆشیەکانی جگەر و گورچیلەو هەوکردنی ناتەواوی گەدە، کەم خوێنی.

- زیانە لاوەکییەکان: کەم خوێنی، کەمبوونی ژمارەی خانەکانی خوێن، هەوکردنی دەماری بینایی، کوێربوون، سەرئێشە، هەوکردنی دەم، ژانی سك، زیانەکانی دڵو دەمار.

فێرکردنی نەخۆش:

هەبوونی قورگ ئێشە، تا، شەکەتیو خوێن بەربوونی نائاسایی دەبێ بە پزیشك ڕابگەیەنرێت، چونکە لەوانەیە پیشاندەری مەهاری چاککردنی خوێنبەری مێشکی ئێسك بێت.

## کلوردیازپوکساید CHLORDIAZPOXIDE

- ناوی بازرگانی: Librium
- گرووپی دەرمانی: هێمن کەرەوە، خەوهێنەر.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥ و ١٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیD

بەکارهێنان: کۆنترۆڵی ماوەکورتی پەشێویو کەمکردنی پەشێوی لەڕاگرتنی لە ناکاوی بەکارهێنانای ئەلکهول، هەروەها بەر لەنەشتەرگەری بەمەبەستی شل بوون.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠ ملگم ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

بەکارنــەهێنان: شــڵەژاوی، شــێتایەتی، شــۆك، گــەورەی پرۆســتات، بــەرزبوونی پاڵەپەستۆی چاو.

زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرســـووڕان، خــەواڵوویی، قــەبزی، وشــك بــوونی دەم، تاریك بینین، وزەوزی گوێ.

پارێزگاریـەکان: لەتەمەنـەکانی سـەرەوە، لە ناتوانایی‌و نەخۆشی جگەر و گورچیلەو نــا هاوســەنگیەکانی خــوێن، بــە وریــایی بەکار بهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

دوای بـەکارهێنانی حـەب تاکەکـە نابێـت کاری لێخوڕین بکات.

**کلورهگزیـــــــــدین گلوکونـــــــــات CHLORHEXXIDINE**

- گرووپی دەرمانی: دژی پاکژکـەرەوەی کلۆردار.
- شێوەی دەرمانی: دەم شۆ
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بـــــەکارهێنان: هەوکردنـــــەکانی دەم‌و برینەکانی دەم‌و چاو.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: دوای شوشـتنی دەم بەسیواك، دەم ١٥ سی سی گیراوەکـە بـۆ ماوەی ٣٠ چرکە ٢جار لە ڕۆژ بشۆرێت.

- زیانــە لاوەکییــەکان: هــەوکردنی دەم، ڕەنگی بوونی دەم‌و ددانـەکانی دەسـتکرد گۆڕینی دەرەکی تام کردن.

فێرکردنی نەخۆش:

ڕێگەنــەدان بــۆ پەیوەنــدی دەرمانەکــە لەگەڵ چاو و گوێ لـەوەها ڕووداوێك چـاو یان گوێ بە ئاوێکی زۆر بشۆردرێت.

بۆچارەســەری شــوێنی ددانــی دەســتکرد ددانەکان لەناو گیراوەی خاوێنکەرەوە بـۆ ماوەی ١ تـا ٢ خولـەك دوو جـار لـە ڕۆژدا

بنێن‌و بەر لەوەی کە جارێکیتر ددانەکان لە ناو دەم دابنێن، دەمەکەتان بەگیراوەی دەمشۆر بشۆن.

**کلروکین فۆسفات**

**CHLOROQUIN PHOSPHATE**

- ناوی بازرگانی: Arolen
- گرووپی دەرمانی: دژی مەلاریا و دژی ئامیب‌و دژی هەوکردن.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٥٠ ملگم‌و شەربەتەکانی ٥٠ ملگم
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: مەلاریا لە جۆرەکانی پلاسمۆدیۆم، ویواکس مەلاریا، اوال، فاکسی پاروم، ئارتریت روماتۆئیدو ئامیباز

ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدار و بە موردی بەکارهێنان‌و بەپێی ویستی پزیشك جیاوازە.

- زیانە لاوەکییەکان: دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن‌و زیانەکانی دڵ، خوران، سەرئێشە، پەشێوی، تاریك بینین. وزەوزی گوێ، هێڵنج‌و کەم بوونی خانەکانی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– بۆ کەمکردنەوەی ترس لە ڕووناکی (فتوفۆبی) باشتروایە لە چاویلکە سوودوەربگیرێت.

– ئاگادارکردنەوەی پزیشك لە هەر چەشنە گیروگرفتی وەکو بیستن‌و بینایی، تاولارزی‌و شەکەتی‌و ڕەش‌وشین بوون‌و خوێن بەربوون.

## کلۆرفینیرامین مالێات
## CHLOR PHENIRAMIN MALEATE

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی هستامین

● شـێوەی دەرمـانی: ئەمپوولـەکانی ١٠ ملگمو حەبەکانی ٤و ٨ ملگم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: چارەسەری هەستیاریەکان، لـیر، ئانـژیوادم، هاتنـەخوارەوەی ئـاوی ئالرژیکی لووت، نەخۆشیەکانی هەوکردن.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ٤ ملگم هەر٤ ملگم هەر٤ تا ٦ کاتـژمێر و لانـی زۆر ٣٦ ملگـم لەپێگەیشتووان.

منداڵان: ٢ ملگم هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

● زیانـە لاوەکییـەکان: سەرسـووڕان، خەواڵوویی، ناهاوسەنگ بـوونی جوڵاکـان، وشکی دەم، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

نابێـت هـاوڕێ لەگـەڵ دەرمانەکـە لەدەرمانـەکانی خەوهێنـەر سـوود وەربگیرێـتو دەبێـت لەخواردنـەوەی ئەلکهول خۆتان بپارێزن.

## کلرپرومازین
## CHLORPROMAZINE-HCL

● ناوی بازرگانی: Largactile

● گرووپی دەرمانی: دژی سایکۆز و دژی ڕشانەوەو هێمن کەرەوە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و ١٠٠و ٢٠٠ ملگمو ئەمپوولەکانی ٥٠ ملگم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بـەکارهێنان: لـە ناهاوسـەنگیەکانی تونـد وەکـو هـێمن کـەرەوە، نزگـەرەکانی خـۆڕاگر، هێڵـنجو ڕشـانەوە، بـەکارهێنان بـەر لـە نەشـتەرگەری وەکـو شـلکەری ماسوولکەکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: لـە ناهاوسەنگیەکانی دەروونی توند ٢٥ تا٥٠ ملگم ماسوولکەیی لێبـدرێت. لـە هێڵـنجو ڕشـانەوەدا تـا ٢٥ ملگم هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

● زیانە لاوەکییەکان:

ئاوسانو (ئسپاسمی) قورگ، تەنگەنەفەسی، کەمبوونی خانەکانی خوێن، لیر، تاریك بینین، وشك بوونی دەم، هێڵنجو ڕشانەوە، میزگیران.

پارێزگاریەکان: لەشیردانو پەلامارەکانی تەشەنوجی، لە پاڵەپەستۆی خوێنو نەخۆشیەکانی جگەر و دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

– بەهۆی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن کاتی هەڵسانی لەسەر زەوی بە ئارامی هەڵسن.

– لە شوشتنی بە ئاوی گەرم یان لە ناو وانی ئاوی گەرم بەهۆی گریمانەی دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن خۆتان بپارێزن.

– باشتروایە کە نەخۆش لە شوێنێکی فێنکدا پشوویدات.

## کاستیرامین CHOLESTYRAMINE

- ناوی بازرگانی: Questran
- گرووپی دەرمانی: دابەزێنەری چەوری خوێن
- شێوەی دەرمانی: تۆزەکانی ٤گمی
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: بەرزبوونەوەی کۆلسترۆلی خوێن، سکچوون کە بەهۆی بەرزبوونەوەی ئەسیدەکانی زەرداو بەدی دێن، لە ژارانگەزی بەدیگوکسین.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتووان بەکارهێنانی خۆراکی٤ گم لە دەرمان بەر لەخواردنو بەر لە نووستنو لادانی زۆر تا ٢٤ گم.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر، گیرانی ڕێڕەوی زەرداو.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، ژانی جومگەو ماسوولکە، قەبزی، گوشراوی پاشەڕۆ، کەمبوونی ڤیتامین A..D..K پەشێوی، هەوکردنی پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگادارکردنی پزیشك لە کاتی هەبوونی خوێن بەربوون‌و پاشەڕۆی ڕەش‌و هەبوونی خوێن لە میزو ڕەش‌و شین بوونی پێست.

هەرگیز تۆزەکە بەبێ ئاو بەکارنەهێنرێت.

## گونادوتروپین CHORIONIC GONADOTROPIN HUMAN (HCG)

- ناوی بازرگانی: Pregnyl
- گرووپی دەرمانی: گونادوترۆپین (هۆرمۆن)
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ٥٠٠و ٥٠٠٠ هەزار یەکە.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX

بەکارهێنان: لەکاتی نابەروەری‌و نەزۆکی ئافرەتان لەپیاوانی تووش بوو بەکەم بوونی هۆرمۆن وەکو چارەسەری گونەکانی نزول نەکردوو.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك

بەکارنەهێنان: تۆمۆرەکانی هیپۆفیز، شێرپەنجەی پرۆستات.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشەو خەمۆکی‌و گەورەبوونی مەمکەکان لە پیاوەکاندا، سکپڕی دەرەوەی منداڵدان.

پارێزگارییەکان: تەنگەنەفەسی، ژانە لاسەر (میگرن) سەرئێشە، ناهاوسەنگیەکانی شلەژاوی، نەخۆشیەکانی دڵ‌و گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– لە هێماکانی دەرەوەی منداڵدان پزیشك ئاگادار بکەن. سەرسووڕان، ژانە لاسەر، ژانی شان، ڕەنگ پەڕین، خوێن بەربوون لە زێ.

– گۆڕین لە تۆنی دەنگ‌و گەورەبوونی چۆك‌و زیپکە لە پیاواندا.

**سایمیتدین** CIMETIDINE

- ناوی بازرگانی: Lagamet
- گرووپــی دەرمــانی: ئانتــا گونیســت وەرگری H2دژی ترشەلۆکی گەدە.
- شێوەی دەرمــانی: حــەبو ئــەمپوولی ٢٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بــەکارهێنان: چارەســەری کورتخایــەنی برینـــــەکانی گـــــەدەو دوازدەگـــــریێ، چارەسەری گەڕانەوەی مەودا لە گەدە بـۆ سورێنچك (ریفلاکس).

- ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتووان ٢ حەب ٢جار لە ڕۆژدا.
- زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، سەرسووڕان، پەشێوی، ژینوکوماستیو (گــەورەبوونی مەمکــەکان لــە پیاوانــدا)و ناتوانـــایی سێکســـی لـــە بـــەکارهێنانی درێژخایـەن، ژانـی ماسـوولکە، کـەمبوونی خانـەکانی خـوێن، بەتایبـەت پلاکتـەکان، لیر.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـاداركردنی پزیشـك لـەرەشو شـین بـوون، شـەکەتی، هەسـت بەنەخۆشـی، چـونکە لەوانەیـە نیشـانەی سـەرهەڵدانی ناهاوسەنگی خوێن بێت.

– بەهۆی هەبوونی (رانیتدین) کەمتر لـەم دەرمانە سوود وەردەگیرێ.

**سیناریزین** CINARIZINE

- ناوی بازرگانی: Stugeron
- گرووپـی دەرمـانی: دژی سەرسـووڕان، بـۆ چارەســەری رەقبــوونی مولوولــەکانی خوێنی دەماغ.
- شێوەی دەرمانی: حەبـەکانی ٢٥و ٧٥ ملگرام.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: چارەسـەر بـۆ سەرسـووڕانو وزەوزی گـــوێ، هێڵـــنجو رشـــانەوە، تێکچـــوون لەســـەفەردا، رەق بـــوونی مولوولەکانی خوێنی دەماغ.

ڕێژەی بـەکارهێنان: یـەك حـەب ٢٥ ملگـم ٣جار لەڕۆژدا.

بەکارنــەهێنان: پــۆرفیری تونــد (جــۆرە نەخۆشییەکی خوێن).

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: خـــەواڵوویی، زیادبوونی ئارەزووی خواردن.

فێرکردنی نەخۆش:

– باشتروایە دوای خواردن بەکاربهێنرێ.

– لــە ســەرەتای بــەکارهێنانی دەرمــان لەوانەیــە خــەواڵوویی بــەدی بێــت، بۆیــە دەبێت لەکاری لێخوڕین خۆتان بپارێزن.

## سیپرۆفلۆکساسینCIPROFLOXACIN

● ناوی بازرگانی: Ciproxin

● گرووپــی دەرمــانی: ئــەنتی بیوتیــك کینولونی.

● شـێوەی دەرمــانی: حەبــەکانی ٢٥٠ و ٥٠٠ ملگمو گیالەکانی٤٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بــەکارهێنان: هـــەوکردنی بەشــــەکانی جۆراوجۆری لــەش بــە تایبــەت هــەوکردنی میزەڕۆ.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتووان یـەك حەب ٥٠٠ ملگم هەر ١٢ کاتژمێر.

● زیانە لاوەکییەکان:

هێڵنج، لیر، تاریك بیـنینو وزەوزی گـوێ، خەواڵوویی، زیـان گەیانـدن بـە گورچـیلە. بــەدیهاتنی کــەم خــوێنیو زیــادبوونی هەستیاری بە ڕووناکی.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراســتن لــە بــەکارهێنانی دژە ترشــەلۆکەکان. هــەڵگری مەگنیســیۆم هاوڕێ لەگەڵ ئەم دەرمانـە تـا ٢ کاتـژمێر پاش بەکارهێنانی دەرمان.

– باشتر وایە پـاش بـەکارهێنانی دەرمـان بەهۆی بەدی هێنانی هەستیاری بەڕوناکی لەبەرامبەر خۆرمەوەستن.

– بەکارهێنانی ٣ لیتر شلەمەنی لەڕۆژدا. ئەوکاتانــەی کــە وارفــاین بــەکار دەهێــنن نابێت لەم دەرمانە سوود وەربگرن.

**سیساپراید CISAPRIDE**

● ناوی بازرگانی: Propuisid

● گرووپـــی دەرمـــانی: زیـــادکردنی جوولەکانی هەرسکردن.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ٥ و ١٠ ملگم و شەربەتەکانی ١٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: هێواشی جوولەی کۆئەندامی هەرســکردن بــەدیهاتوو لــە نەخۆشـی شەکرە، ناهاوسەنگیەکانی گەدە. (لەگەڵ هێماکانی زوو تێر بوون) بای سك، کـەمی ئـــارەزووی خـــواردن، زوو تێربـــوون، گەڕانەوەی خۆراك لە گەدە بۆ سورێنچك، قـــەبزی درێژخایـــەن بـــەدیهاتوو لـــە ناهاوسەنگی جوولەی ڕیخۆڵە.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: گرێـدراو بـە ڕێـژەی پێویست ١ تا ٢ حەب ٣ جار لە ڕۆژدا.

بەکارنـــەهێنان: گیرانـــی کۆئەنـــدامی هەرســـکردن، کونبـــوونی کۆئەنـــدامی هەرسـکردن. هـەبوونی خـوێن بـەربوونی کۆئەندامی هەرس کردن.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سکچـــوون، زیـــادبوونی هـــەراو هۆریـــای ســـك، گـەورەبوونی مەمکـەکان لـە پیاوانـدا، زیادکردنی میز، سەرئێشە.

فێرکردنی نەخۆش:

– نەخۆشەکانی دڵو دەرمـان دەبێـت بـە وریای بەکاربهێنرێن.

– ئـەم دەرمانـە نـابێ هاوکـات لەگـەڵ دەرمانـەکانی دژی خـەمۆکی یـان ئـانتی بیوتیکەکان بەکاربهێنرێن.

– ئـەم دەرمانـە کاریگـەری دەرمـانی وارفارین زیاد دەکات.

**سیتی کولین CITICOLIN**

● ناوی بازرگانی: Neurochline

● گرووپـــی دەرمـــانی: زیادکـــەری تێپەڕبوونی خوێنی دەماغ.

● شێوەی دەرمـانی: ئەمپوولـەکانی ٢٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیD

بـەکارهێنان: دابـەزینی ئاسـتی وشـیاری دوای لێـدانی مێشـك، کۆمـای متابولیـك

بــەدیهاتوو لــە ژەهراویــەکان، بــەهۆی هێنانــەوەی نــەخۆش پــاش بــێ هۆشــی، بەشــێوەی گشــتی نــاڕێکی دەمارەکــانی دەماغ کاربردی هەیە.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: ١٠٠ تــا ٥٠٠ ملگــم بەشێوەی دەرزی لێدان ماسوولکەیی یـان دەماری یەك تا دووجار لە ڕۆژدا.

- زیانــــە لاوەکییــــەکان: دابــــەزینی پاڵەپەســــتۆی خــــوێن، بــــێ خــــەوی، پەرێشانیو پەشێوی.

پارێزگاریــــەکان: لــــە چارەســــەری بەرزبوونــــەوەی پاڵەپەســــتۆی خــــوێن سوودی لێ وەرنەگیرێ.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگاداربوون لە دابـەزینی پاڵەپەسـتۆی خوێن.

## کلاریترمایسین

## CLARYTHROMYCIN

- ناوی بازرگانی: Biaxin
- گرووپــی دەرمــانی: ئــەنتی بیوتیــك ماکرولیدی.
- شێوەی دەرمانی: حەبو تۆز
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بــەکارهێنان: چارەســەری هــەوکردنی هیلکۆبـاکتر پیلـوری گـەدە، چارەسـەری هەوکردنی قوڕگو لەرزە (فارنژیت).

بەکارنەهێنان: ٥٠٠ ملگم هەر ١٢ کاتژمێر.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچوون، ســك ئێشــە، سەرئێشــە، ڕشــانەوە، کـەمبوونی خانـەکانی خـوێن بـە تایبـەت پلاکتیکەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

لە کـاتی لـەبیرکردنی بەکارهێنان تـا ئـەو کاتــەی کــە نــۆرەی بــەکارهێنانی پاشــتر نــەهاتووە لەهەرکاتــدا ڕێــژەی لــەبیرکراو بەکاربهێنرێت.

## کاماستین CLEMASTINE

- ناوی بازرگانی: Tavegil
- گرووپی دەرمانی: دژی هەستیاری، دژی وەرگری H2
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١ملگم‌و ئەپولی ٢ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان: هەستیاری (لێر- هاتنەخوارەوەی ئاو لە لووت، هەوکردنی بەشی ناوەوەی چاو، نەخۆشیەکانی پێست.

ڕێژەی بەکارهێنان: یەك حەب دووجار لە ڕۆژدا.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، خەواڵوویی، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، قەبزی‌و وشك بوونی دەم، لێر، میزگیران، سووتانەوەی ڕێڕەوی میز، تاریك بینین، شەکەتی، زیادبوونی ترپەی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول‌و لێخوڕی پاش بەکارهێنانی دەرمان.

## کلیدینیوم- سی CLIDINIUM- C

- ناوی بازرگانی: Librax
- گرووپی دەرمانی: هێمنکەرەوە دژی ئەسپاسمی گەدەو ڕیخۆڵە.
- شێوەی دەرمانی: حەب‌و هەڵگری ٢\٥ ملگم کلیدینیۆم‌و ٥ ملگم کلرۆدیازیۆکساید.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیD

بەکارهێنان: چارەسەری برینی گەدە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب ٣ تا ٤جار لەڕۆژ بەر لە خواردن‌و بەرلەنووستن. لەکەسانی بەتەمەن ٢جار لە ڕۆژ بدرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بەم گرووپە دەرمانە. بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی ناوچاو. گیرانی کۆئەندامی هەرس، میاستنی گراویس.

زیانە لاوەکییەکان: بێ هۆشی‌و خەواڵوویی، سەرسووڕان، پەشێوی، بێ ئۆقرەیی، وشکی دەم، گیرانی پاشەڕۆو میز. ترپەی دڵ، تاریك بینین، خوران.

پارێزگاریـــەکان: پرکـــاری تیرۆئیـــد، نەخۆشـی دەمــار کرونـر و نــارێکی دڵ، گەورەیی پرۆستات.

فێرکردنی نەخۆش:

– بۆ لابردنی وشکبوونی دەم لە بنێشتو نـەبات یـان شـلەمەنیەکانی تـر سـوود وەربگرن.

– خۆپاراسـتن لەئەنجامـدانی ئەوکارانـەی کـە پێویسـتی بـەئاگاداری هەیـە وەك لێخوڕینی ئۆتۆمبێل.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

– تـا ٢ کاتـژمێر پـاش خـواردنی ئـەم دەرمانـە لەدەرمانـەکانی دژی سکچـوون سوود وەرنەگیرێ.

## کلیندامایسین CLINDAMYCIN

● ناوی بازرگانی: Dalacin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ١٥٠ و ٣٠٠ ملگـم و ئەپولـەکانی ١٥٠ ملگـم، شەربەتەکانی ٧٥ملگم ٥ سی سی

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بـەکارهێنان: هەوکردنـەکانی پێسـتو سیەکانو ئێسك.

● ڕێژەی بەکارهێنان: ١٥٠ تـا ٤٥٠ ملگـم هەر ٦ کاتژمێر خۆراکیو یـان ٣٠٠ تـا ٩٠٠ ملگم دەمار یان ماسوولکەی هـەر ٦ تـا ٨ کاتژمێر لانی زۆر ٢٧٠٠ ملگم لە ڕۆژدا

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، منـداڵانی کەمتر لە یەك مانگ.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سـك ئێشـــە، هەستکرن بە چێژی کانزایی. زیـاد بـوونی ئەنزیمـەکانی جگـەر، زەردەیـی، لـیر، هێڵنجو ڕشانەوە، ئاوسانی جومگە.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەوکاتەی کە دەرمان لەشێوەی خۆراك بـــەکاردەهێنرێت، دەرمانەکـــە بـــە پەرداغێکی ئاو بەکار بهێنرێت

– بـــۆ کەمکردنـــەوەی زیانـــەکانی هەرسـکردن دەکـرێ لەگـەڵ خـواردن بەکاربهێنرێت.

– ماوەی دەرمانەکە دەبێت تەواو بێت ١٠ تا ١٤ ڕۆژ.

- ئاگادارکردنەوەی پزیشك لە ڕوودانی قورگ ئێشە دا، تاوو شەکەتی.
- ئاگادارکردنەوەی پزیشك لە هەر چەشنە سکچوونێك.

**کلوبێتازۆل CLOBETAZOL**

- ناوی بازرگانی: Temorate
- گرووپی دەرمانی: کورتون
- شێوەی دەرمانی: کرێمو مەڵهەم.

بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیلەسێ مانگی یەکەمی سکپڕی D و لە مانگەکانی تری سکپڕیدا گرووپیC

بەکارهێنان لەشیردان: بەوریایی

بەکارهێنان: دژی هەوکردنی شوێنی بەهێزێکی بەرز و بەتایبەت لە ئەکزیماو پسوریازیس.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢ جار لە شوێنی مەبەست بماڵدرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بە کورتونو هەوکردنەکانی میکرۆبیو کەڕوویی.

- زیانە لاوەکییەکان: سووتانەوە، وشکی، خورانی پێست، زیپکەو فولیکولیت، گۆڕینی ڕەنگی پێست، ناسکبوونی پێست، زیاد بوونی هەوکردن.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی سەرو دەمو چاو.
- بەکارهێنانی دەرمان بەلانی زۆر تا ١٤ڕۆژ درێژەی هەبێت.
- خۆپاراستن لەپەیوەندی بەشەکانی تووش بوو لەگەڵ خۆر. چونکە لەوانەیە ببێتەهۆی سووتان لەبەر خۆر.
- بەکارهێنان لەسەر شوێنەکانی هەوکراوو شوێنەکانی خراپ بوو.

**کلوبوتینول CLOBUTINOL**

- ناوی بازرگانی: Silomat
- گرووپی دەرمانی: دژی کۆکە، مەهارکەری ناوەندی کۆکە.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٤٠ ملگمو ئەپولی ١٠ ملگمو دلۆپەکانی ٦٠ ملگم لە هەر مللیتر.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان: کەمکردنی کۆکەکانی وشك

ڕێژەی بەکارهێنان:
پێگەیشتووان: ١ تا ٢ حەب لە ڕۆژ
منداڵانی سەرەوەی ٣ساڵ ١٠ تا ٢٠ دڵۆپ ٣جار لە ڕۆژدا، منداڵانی تەمەن خوار ٣ ساڵ ١ دڵۆپ بۆ هەر کیلۆگرامی کێشی لەش.
بەکارنەهێنان: گەشکە، شڵەژاوی.

● زیانە لاوەکییەکان:
هێڵنجو ژانەکانی سک، بێ خەویو لەهەندێ دۆخدا خەواڵوویی.

فێرکردنی نەخۆش:
- بەر لەبەکارهێنانی ئەم دەرمانە دەبێت هۆی کۆکە بزانرێت.
- نابێت ئەم دەرمانە بۆماوەیەکی درێژخایەن بەکار بهێنرێت.

## کلوفیبرات CLOFIBEATE

● ناوی بازرگانی: Atromid
● گرووپی دەرمانی: دابەزێنەری چەوری خوێن.
● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٥٠٠ملگم.
● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C
بەکارهێنان: بەرزبوونەوەی چەوری خوێن، نەخۆشی شەکرە.
● ڕێژەی بەکارهێنان: ٢گرام لەڕۆژ لە ٤ ژەمی دابەشکراو.
بەکارنەهێنان: سکپڕی، شیردان، ناهاوسەنگی لە کارکردی جگەر یان گورچیلە، بەردی زەرداو یان میزڵدان.
● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، زیادبوونی کێش بەهۆی زۆر خواردن، بەردی زەرداو، خەواڵوویی، کەمبوونی ئارەزووی سێکس، لیر، خوران، وەرینی قژ، نارێکی ترپەی دڵ.
ڕاسپێردراوەکانی پزیشک:

خۆپاراستن لەبەکارهێنانی ئەم دەرمانە لەگەڵ وارفارین.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێ.

– ئەگەر پاش سێ مانگ چەوری خوێن دانەبەزێت نابێت دەرمان بەکاربهێنرێت.

– سەردانی پزیشك كردن لەكاتی هەستكردن بەئێش لەلەشدا.

– خۆپاراستن لەبەکارهێنانی هاوکاتی ئەم دەرمانە لەگەڵ دەرمانەکانی دابەزێنەری شەکری خوێن لوستاتین.

– لەماوەی چارەسەری تاچەند مانگ دوای ئەمە دەبێت رێگری لەسك پڕی بکرێت.

## کلومیفن CLOMPHENE

- ناوی بازرگانی:

Clomid-milophene

- گرووپی دەرمانی: دژی ئستروژن
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠ ملگم
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX

بەکارهێنان: بۆچارەسەری نەزۆکی، لەبارەی دەرنەچوونی هێلکە لە هێلکەدان، نەخۆشی فیبرۆکیستیکسی مەمك. جوولێنەری رژێنە سێکسیەکان.

رێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠٠ ملگم لە رۆژد بۆ ماوەی ٥ رۆژ لە رۆژ لە رۆژی سووڕی مانگانە.

بەکارنەهێنان: سکپڕی، لە نەخۆشیەکانی جگەر و خوێن بەربوونی ئافرەتان بەهۆیەکی نادیار، کیستی هێلکەدان، ناتەواوی بینین.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، بێ خەوی، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، زیادکردنی کێشی

لەش، هێڵنج، ژانی مەمك، سكپڕی، تاریك بینین، لیر.

فێركردنی نەخۆش:

– ئاگاداركردنی پزیشك لەهەبوونی ژانی سك، چونكە لەوانەیە نیشانەی دڕانی كیسی هێلكەدان بێ.

– لەكاتی بەدەركەوتنی ترس لەڕووناكیو تاریك بینینو دووربینین پزیشك ئاگاداربكەن.

– لەكاتی فرامۆشكردنی ژەمێكی دەرمان ژەمیتر دووبەرامبەركەن، ئەگەر زیاتر لەیەك ژەم فرامۆشكرا پزیشك ئاگاداركەن.

– وەلامی دەرمان بەشێوەیەكی ئاسای ٤ تا ١٠ ڕۆژ دوای ڕۆژی كۆتایی دەرمان دەستپێدەكات.

– لەكاتی سەلماندنی سكپڕی، دەرمانەكە بەكارنەهێنرێت.

## CLOMIPRAMINE كلومیپرامین

- ناوی بازرگانی: Anafranil/Tranquox
- گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆكی، دژی دوودڵی، وەسواسی.
- شێوەی دەرمانی: حەبەكانی ١٠،٢٥،٥٠،١٠٠ ملگم.
- بەكارهێنان لەسكپڕیدا: گرووپیC

بەكارهێنان لەشیردان: سوودەكانی دەرمان لەبەرامبەر زیانەكاندا هەڵسەنگێنرێت.

بەكارهێنان: خەمۆكی، پەشێوی، ترس لە ئامادەبوون لەناو خەڵكدا، ناتەواویو دوودڵی.

ڕێژەی بەكارهێنان: لە ناهاوسەنگیەكانی دوودڵی ٢٥ ملگم خۆراكی سێ جار لە ڕۆژدا بەلانی زۆر تا ٢٥٠ ملگم لە ڕۆژدا.

بەكارنەهێنان: ویستی دڵی ئەم دواییە تا ٢ هەفتە دوای وەرگرتنی گرافیل سیپرومین، سكپڕی.

● زیانــە لاوەکییــەکان: سەرســووڕان، سەرئێشە، خەوالّوویی، شلّەژاوی، لەرزین، شەکەتی، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ناتەواوی لێدانی دڵ، قەبزی، سکچوون، میزگیران، وشك بوونی دەم، تاریك بینین.

پارێزگاریەکان: بەکارنەهێنانی ئەلکهول، گەشکە، زیادبوونی پاڵەپەستۆی ناو چاو، نەخۆشی شەکرە، گەورەیی پرۆستات، ناتەواوی لەکارکردی جگەر، پرکاری پیروئیدی، ئەو نەخۆشانەی کە بیر لەخۆکوشتن دەکەنەوە.

فێرکردنی نەخۆش:

- نابێت دەرمانەکە ورد بکرێ.
- کاریگەری چارەسەرکردنی دەرمانەکان پاش ٢ تا ٣ هەفتە بەدەر دەکەون.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.
- خۆپاراستن لە بەکارنەهێنانی دەرمانەکان ئەگەر ماوەیەکی درێژ بەکارهێنراوە، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی سەرئێشە، هێڵنج، ڕشانەوە، ژانی ماسوولکەو لاوازی.
- بۆ پێشگرتن لەهەستیاری بە ڕووناکی دژی خۆر سوود وەربگیرێ.
- لەوکاتەی کە ئەلکهول بەکاردەهێنرێت خواردنی دەرمان تا بەیانی ڕابگیرێ.
- لەکاتی سەرهەڵدانی هێماکانی هەرسکردن دەرمانەکە هاوڕێ لەگەڵ خواردن یان شیر بەکاربهێنرێت.

**کلونازیپام CLON ZEPAM**

● ناوی بازرگانی: Rivotril<clonopin

● گرووپی دەرمانی: دژی گرژی، برك، خەوهێنەر.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١و ٢ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیD

● بەکارهێنان: گەشکە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٠\٥ ملگم ٣ جار ڕۆژانە، دەکرێ ژەمی دەرمانەکە هێواش هێواش هەر ٣ ڕۆژ ٠\٥ تا ١ ملگم زیاد بکرێت تا لانی زۆر ٢٠ ملگم لە ڕۆژ دا.

بەکارنـــەهێنان: نەخۆشـــی جگـــەر، بەرزبوونی پاڵەپەستۆی ناوەوەی چاو

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: خـــەواڵوویی، سەرئێشە، سەرسووڕان، هاتنەخوارەوەی ئاو لە لووت، قەبزی، هێڵنج، سووتانەوەی ڕێڕەوی میز، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

- دوای ئـــەوەی کـــە دەرمانەکـــە بـــۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەکار نەهێنرابێت.

- دەرمانەکـە لـەناکاو بـەکار نـەهێنرێت، بەکارنـــەهێنانی دەرمانەکـــە دەبێـــت لەماوەی چەند هەفتە ئەنجام بدرێت.

## کلونیدین CLONIDINE

● ناوی بازرگانی:

Catapres-Dixarit

● گرووپـی دەرمـانی: دژی پاڵەپەسـتۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٠\١٢ ملگم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بـــەکارهێنان لـــە ســـکپڕیدا: لـــەماوەی شیردان دەبێت بەکارهێنانی ڕابگیرێت.

بەکارهێنان: بۆ چارەسـەری پاڵەپەسـتۆی خـوێن، واز هێنــان لــە تلیــاك مــاددە سـڕکەرەکان، پێشــگرتن لــە میگــرین، گرگرتن، لەزان کەوتن.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: ٠\١١ ملگــم ٢ جــار لـەڕۆژدا بەشـێوەی ئاسـایی ٠\١٢ تـا ٠\١٦ ملگم ڕۆژانە.

بەکارنــەهێنان: هەســتیاری ســەبارەت بەدەرمانەکە.

● زیانە لاوەکییەکان:

سەرســـووڕان، لاوازی، تووڕەبـــوون، دابەزینی پاڵپەستۆی خوێن، وشـك بـوونی دەم، قەبزی، میزگیران، خوران، ناتوانایی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشــتر وایــە بــەکارهێنانی دەرمانەکــە کاتی خەوبێت.

- نابێـــت بەکارنـــەهێنانی دەرمانەکـــە لەناکاوبێت، چونکە لەوانەیـە نیشـانەکانی بەکارنەهێنا بەدەرکـەون، بەرزبوونـەوەی پاڵەپەسـتۆی خـوێن، بێخـەوی، لاەرزیـن،

هێلنج، ئـارەقکردن، زیـادبوونی ژمـارەی ترپەکانی دڵ.

هاوکات لە دەرمانەکانی دژی کۆکە، دژی هەلامەت یان ئالرژی سوود وەرنەگیرێ.

– ســـەردانی پزیشـــك بکـــەن لـــەکاتی سەرهەڵدانی بریینی دڵ، قورگ ئێشـە، تـا، ژانی سینگ، هێمایەکانی ئانژیوادم.

– خۆپاراستن لەڕاوەستان لەبەر خۆر.

## کلوتریمازول CLOTRIMAZOL

ناوی بازرگانی: Canesten

- گرووپی دەرمانی: دژی کەڕوو
- شـێوەی دەرمـانی: کرێمـی وارژینـال، حـەبی وارژینـاڵ ۱۰۰ ملگـم، گـیراوەی ۱ لەسەدا، کرێم ۱ لەسەدا.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بـــەکارهێنان لەشـــیردان: بـــە وریـــایی بەکاربهێنرێت.

بـەکارهێنان: کەچـەڵی پـێ، ران، لـەش، قلێشانی پێ و لەش. هەوکردنی منـدالآن، کەڕووی ناوپەنجەی پێ.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە دووجار لەسـەر شوێنەکە بمالدرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری دەرمان، چاو.

- زیانـــــە لاوەکییـــــەکان: خـــــوران، سووتانەوە، لـیر، بـای سـك، جووتبـوونی دردناك، ناهاوسەنگی لە تاقیکردنەوەکانی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– سەرەوەی برینەکە نابێت بپچڕێ.

– بـەکارهێنانی دەرمانـە دەبێـت تـەواو بکرێت لە دوو هەفتە تا ٦ مانگ.

– دەرمانەکە بە پەنجەوانە بـەکاربهێنرێن تا لە هەوکردنی زیاتر پێشگیری بکرێت.

– لـەجووتبوون لـەکاتی چارەسـەرکردنی زێ یان داوێن خۆتان بپارێزن.

– بەشـــێوەیەکی بـــەردەوام تەنانـــەت لەکاتی سووڕی مانگانەش بەکاربهێنرێت.

## کلۆپیدۆگرل CLOPIDOGREL

- ناوی بازرگانی: Plarix
- گرووپـــی دەرمـــانی: دژی پلاکـــت، مەهارکەری کۆبوونەوەی پلاکتی
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٧٥ ملگم
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان لە شیردا: ڕاناسپێردرێت

بـــەکارهێنان: ئەوتاکانـــەی کـــە تووشـــی دڵەویستی بوونـەو کاندیـدی ئانـژیوگرافیو بالۆن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ حەب یەکجار ڕۆژانە خۆراکی.

بەکارنەهێنان: برینی گەدە و دوازدەگرێ

زیانە لاوەکییەکان:

سەرئێشە، سەرسـووڕان، لاوازی، قـەبزی، سکچـــوون، خـــوێن بـــەربوون، کۆکـــەو تەنگەنەفەسـی، ژانـی جومگـەکان، ژانـی سنگ، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن.

پارێزگاریـەکان: ناتـەواوی لـە کـارکردنی جگەر ئەو منداڵانەی کە نەخۆشی جگـەرو کەمبوونی خڕۆکەی سپییان هەیە.

فێرکردنی نەخۆش:

ئاگـاداركردنی پزیشـك لەهـەر چەشـنە رەش‌و شـین بـوون‌و خـوێن بـەربوونی نائاسایی.

## کلۆگزاسیلین CLOXACILIN

- ناوی بازرگانی:

Orbemin. tegopen

- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك
- شـێوەی دەرمـانی: کەپسـوولەکانی ٢٥٠و ٥٠٠ ملگـم، ڤیالـەکانی ٢٥٠و ٥٠٠و ١ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بـــەکارهێنان لـــە شـــیردان: بـــەوریایی بەکاربهێنرێت.

بەکارهێنان: هەوکردنـەکانی میکرۆبـی بـە ئەستافیلوکۆکسی زێرین (ئـەو میکرۆبـەی کـــە بەرهەمهێنـــەری ئـــانزیمی پـــنی سیلینازە).

ڕێـژەی بـەکارهێنان: پێگەیشـتووان ٢ تـا ٤گـم خـۆراکی ڕۆژانـە هـەر ٦کاتـژمێر لـە ژەمەکان دابەشکراوە، منـداڵان ٥٠ تـا ١٠٠

ملگم هەر ٦ کاتژمێر لە ژەمەکانی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بەدەرمانی ساوایان

- زیانە لاوەکییەکان:

هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوونی بەدیهاتوو لە ئەنتی بیوتیك، ژانی ئەپیگاستر.

فێرکردنی نەخۆش:

– ماوەی دەرمانەکە دەبێت تەواو بکرێت، ١٠ تا ١٤ ڕۆژ تا لە ریشەکێشکردنی میکرۆب دڵنیابین.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەهەر چەشنە سکچوونێك.

– دەرمانەکە بەگەدەی ئەخرین‌و بەپەرداغێك پڕ لەئاو بەکار بهێنرێ.

## کلوزاپین CLOZAPIN

- ناوی بازرگانی:

Ciozaril-lepnex

- گرووپی دەرمانی: دژی سایکۆز، ناهاوسەنگی توندی دەروونی
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و١٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان لە شیردان: راناسپێردرێت

بەکارهێنان: چارەسەری نەخۆشەکانی ئەسکیزوفرنی کە بەدەرمانەکانیتر وەلامیان نەداوەتەوە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٥ ملگم خۆراکی ٤جار یان ٣جار لە ڕۆژ کە دەکرێت لە ٢ تا ٥٠ لە ڕۆژدا دەرمانەکە زیاد بکرێت.

بەکارنەهێنان: گەشەکەی کۆنترۆڵ نەکراوی، کەمبوونی خرۆکە سپییەکان، بەکارهێنانی ئەلکهول، لەوکاتەی کە خرۆکە سپییەکان کەمترە لە ٣٥٠٠.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، خەوالّوویی، بێ ئۆقرەیی،

لــــەرزین، شـــڵەژاوی، بـــێ خـــەویی، بەرزبوونـــەوەی پاڵەپەســـتۆی خـــوێن، هێڵنج، وشـک بـوونی دەم، سـووتانەوەی سەرەوەی دڵ، تـا، میـزگیران، کێشـە لـە تۆو پژاندن.

فێرکردنی نەخۆش:

– تاقیکردنەوەکانی خـوێن هـەر هەفتـەی تا ٦ مانگ چك بکرێتو لـەکاتی دابـەزینی ژمـارەی خڕۆکـە سـپییەکان دەرمانەکـە بۆماوەیەکی کاتی ڕابگرێ.

– دەرمـان نابێـت بەشـێوەی لـە ناکـاو ڕابگیرێ.

– خۆپاراســـتن لـــــە بـــــەکارهێنانی دەرمانـــــــەکانی دژی کۆکـــــــە، دژی هەستیاریو هەڵامەت.

– بەهۆی گریمـانی بـەدیهاتنی هـەوکردنی کـــەپوو لەدەمـــدا. تەندروســـتی دەم بەشێوەیەکی ڕێکوپێك پەیڕەو بکرێت.

– خۆپاراسـتن لـە وەسـتان لـە کـەشو هـەوای گـەرم بـەهۆی گریمانـەی گـەریاز دەگی.

– ئاگادارکردنی پزیشك لـەکاتی هـەبوونی قورگ ئێشەو هەستکردن بەنەخۆشی، تـا، خوێن بەربوون، برینی دەم.

## کۆل تار COAL- TAR

- ناوی بازرگانی: Poiytar
- گرووپی دەرمانی: دژی شۆرەی سەر
- شـــێوەی دەرمـــانی: شـــامپۆ ١٪، لوسیۆن، ٢٪ سابوون ٢٪
- بـەکارهێنان لەسـکپڕیدا: توێژینـەوەی لەسەر نەکراوە.

بـــەکارهێنان: پســـپۆریازیس، درماتیـــت، ئاتوپیك.

ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان ٢ تـا ٣ جار لە ڕۆژد بەکار بهێنرێت، سابوون ٢ تا ٣ جـار لـەڕۆژ، شـامپۆ ٢ تـا ٣ جـار لـە هەفتە لەگەڕماو بەکار بهێنرێت.

- زیانە لاوەکییەکان: زیانەکانی پێسـت، هەستیاری بە ڕووناکی، زیپکە.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی دەرم لەشوێنی هەوکردن، پۆرگ، برین.

– دەرمان لەوانەیە ببێتەهۆی رەنگاوی بوونی پێستو جلوبەرگ.

– بەکارنەهێنانی منداڵانی تەمەن کەمتر لە چوار ساڵ.

– بەهۆی گرگرتن نابێ لەبەرامبەر بلێسەی ئاگار دابنرێت.

– لانیکەم پاش بەکارهێنان دەرمانەکان نابێت تا ٢٤ کاتژمێر لەبەر رووناکی خۆر راوەستێ.

**کۆئەمۆکسی کلاوCO-AMOXICLAV**

● ناوی بازرگانی: Augmentin-clavalin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٦٢٥و ٣٧٥ ملگمو شەربەت، پێکهاتەی ئەموکسی سیلینو کلاونیکە.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

بەکارهێنان لەشیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

بەکارهێنان: هەوکردنەکانی سینوسەکان، سی، گوێی ناوەند.

رێژەی بەکارهێنان: ١حەب هەر ٨ کاتژمێر بۆ پێگەیشتووان، منداڵان ٣٠–٤٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش (ئەمۆکسی سیلین).

بەکارنەهێنان: هەستیاری دەرمانی

● زیانە لاوەکییەکان:

هێڵنج، رشانەوە، سکچوون، زیانەکانی گورچیلەو پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– ٢حەبی ٢٥٠ بەرامبەر حەبێکی ٥٠٠ ملگم نینو هۆیەکی ئەو کلاونیك ئەسیدە.

– دەرمانەکان لەکاتژمێری دیاریکراو بەکاربهێنرێت.

پاش کردنەوەی دەرکی شەربەت.

– دەکرێت تا ١٠ رۆژ لە بەفرگرەکە هەڵبگرێ.

–ماوەی چارەسەرکردن ١٠ تا ١٤ رۆژە.

- ئاگاداركردنی پزیشك لەوكاتانەی كە سكچوونو ژانی سكو هەبوونی خوێن لە پاشەڕۆ ڕوودەدات.
- لە ئافرەتەكاندا هەوكردنی دووەم لەوانەیە بەشێوەی جۆراو جۆرەكانی سپیو پەنیری ڕوودەدات.

## كلشیسین COLCHICINE

- ناوی بازرگانی: Colchhimax
- گرووپی دەرمانی: دژی ژانی جومگە.
- شێوەی دەرمانی: حەبەكانی ١ ملگم
- بەكارهێنان لەسكپڕیدا: گرووپیC
- بەكارهێنان لە شیردان: مەترسیدارنەبوونی ئەم دەرمانانە نەسەلمێنراوە.

بەكارهێنان: ژانی جومگە، ڕاگرتنی ڕەوتی پێشكەوتنی عەسەبی لە (ms) تای دەریای ناوەراست، ئامیلوئیدوز.

ڕێژەی بەكارهێنان: بۆچارەسەركردنی ژانی جومگە، ١تا٢ حەب لە سەرەتادا و پاشان نیو حەب هەر ٦ كاتژمێر بۆ پێشگرتن لە پەلەمارەكانی ژانی جومگە، نیو تا حەبێك لە ڕۆژدا بەپێی پێویست.

بەكارنەهێنان: نەخۆشی گورچیلە، جگەر، دڵ، هەرسكردنو خوێن، برینەكانی توندی كۆئەندامی هەرس.

- زیانە لاوەكییەكان: هێڵنج، ڕشانەوە، سەرسووڕان، كەمبوونی ژمارەی خڕۆكە سپییەكانو سوور، وەرینی قژ، میزهاتن، ژانەسك، سكچوون، لیر.

فێركردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەكار هێنانی ئەلكهول.
- بەكارهێنانی دەرمان لەگەڵ خواردن یان شیر.
- ئاگاداركردنی پزیشك لەپەیدابوونی ژان، سووربوونی شوێنەكانی سفت لە بەڵەكی پێ، قورگ ئێشە، خوێن بەربوون، لاوازی، بێ هەستی، تەزین.

## ئسترۆژن کۆنژۆگە
## CONJUGATEED ESTROGENS

- ناوی بازرگانی: Premarin
- گرووپی دەرمانی: ئسترۆژن
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ٥مل کرام، حەبەکانی ٠\٦٢٥ و ١\٢٥ ملگم
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX
- بەکارهێنان لەشیردان: ڕێپێدراو نیە.

بەکارهێنان: چارەسەری گرگرتن، لەزان کەوتن، پێشگرتن لەپووکی ئێسک، چارەسەری شێرپەنجەی پرۆستاتو مەمکێك کە نەکرێ نەشتەرگەری بۆ بکرێ.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆچارەسەری هێماکانی لەزان کەوتن، ١\٢٥ ملگم ڕۆژانە بۆماوەی ٢١ڕۆژو ٧ڕۆژ ڕابگرێتو جارێکیتر دووبارەبکرێتەوە.

بەکارنەهێنان: هەبوونی ترومبوز، بەستنی خوێن لە شوێنێکی لەش، (مەین) خوێن بەربوونی ناسروشتی لە منداڵدان.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، هێڵنج، گریمانەی خوێن مەین لەسیو دەماری پێ.

پارێزگارییەکان: میگرن، لاژانەسەر، پێشینەی هەبوونی شێرپەنجەی مەمك لە خێزاندا، ناهاوسەنگی لەکارکردەی گورچیلەو جگەر، تەنگەنەفەسیو شڵەژاوی بە وریایی لێ بەکاربهێنرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

– کۆنترۆڵکردنی پاڵەپەستۆی خوێنو چەوری خوێن بەشێوەی ئاساییو ڕێكوپێك.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەهەبوونی تۆمۆر لەسینگدا، خوێن بەربوونی منداڵدان، زەردەیی، میزی تیر، پاشەڕۆی بێ ڕەنگ، سەرئێشە، تاریك بینین، ژانەسك، بێ هەستیو وشکی لە بەڵەکی پێ، ژانی سینگ.

## کۆنترا سپتیوەکان
## CONTRACEPTIVE DE-HD-LD

- ناوی بازرگانی:
  Marveelon- yasmin
- گرووپی دەرمانی: هۆرمۆن
- شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی LD- HD- DE وتری فازیك
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX
- بەکارهێنان لەشیردان: ڕاناسپێردرێت

بەکارهێنان: بەرگرتن لە سکپڕی، چارەسەری خوێن بەربوونی لە ڕاددەبەدەر و خوێن بەربوونی نائاسایی منداڵدان.

ڕێژەی بەکارهێنان: دەستپێکی بەکارهێنانی ئەم حەبە لەکاتی سووڕی مانگانەدا پێنج ڕۆژی یەکەمە، باشتروایە بۆ دڵنیایی زیاتر بەکارهێنانی یەکەمین لەڕۆژی یەکەمی خوێن بەربوونی سووڕی مانگانە دەست پێبکات وەتا کۆتایی ٢١ حەب هەرشەوێك یەك حەب بخۆردرێتو پاشان هەفتەیەك بەستەیەکی تر دەست پێبکات.

بەکارنەهێنان: شێرپەنجەی کۆئەندامی زاوزێ، خوێنمەین لە دەمارەکان، دڵ ویستی، تومۆری جگەر، نەخۆشی جگەر، نەخۆشی دەمارەکانی دڵ، ئافرەتانی تەمەن سەرووی چل ساڵ، لەپڕ وەستانی مێشك.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوون، بای سك، قەبزی، زەردوویی، لەکەکانی دەمو چاو، زیپکە، لیر، ناهاوسەنگیەکانی سووڕی مانگانە، گۆڕانکاریەکانی مەمك، پەشێوی، خەمۆکی، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– لە سێ هەفتەی یەکەمی ئەم حەبانە دەبێ لەشێوازێکی تری بەرگرتن لەسکپڕی سوود وەربگیرێ.

– ئەگەر یەك ژەم خواردنی دەرمانتان فەرامۆشکرد دەبێت دەستبەجێ پاش

بەبیرهاتنەوە بەکاربێنن، بەڵام ئەگەر تا ژەمیتر بەبیرتان نەبوو لە ژەمیتر ٢ دانە حەب بخۆن، ئەگەر دوو ڕۆژ لەسەریەك بەکارهێنانی دەرمانتان لەبیرکرد ڕۆژانە ٢ حەب ڕۆژی پاشتر بەکاری بێننو ئەگەر سێ ڕۆژ لەسەریەك بەکارهێنانی دەرمانتان فەرامۆشکرد دەبێت بەکارهێنانی دەرمان ڕابگیریو لە سووڕی مانگانی پاشتر جارێکیتر دەرمان بەکاربێنن.

– ئەگەر دەتانەوێت لە حەب وەکو ڕێگرتن پاش جووتبوون سوود وەربگرن، دوو حەبی HD لانی زۆر ١٢ کاتژمێر پاش جووتبوونو حەبی تر ١٢ کاتژمێر پاش بەکاربێنن.

– حەبەکە هەر ڕۆژ لەکاتژمێرێکی دیاریکراو بەکاربێنن.

– تەنگەنەفەسی یان میگرن لەوانەیە توند بێت.

**کۆتریموکسازول**

**CO- TRIMOXAZOLE**

- ناوی بازرگانی: Bactrim
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی بە تەمەنەکان. ٨٠\٤٠٠ ، منداڵان ٢٠\١٠٠ شەربەت ٢٠٠ ملگم لە ٥ سی سی.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی B (لەسێ مانگی کۆتاییدا بەکارهێنانی قەدەغەیە)
- بەکارهێنان لەشیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

بەکارهێنان: هەوکردنەکانی کۆئەندامی میز، گوێی ناوەند، پرۆستات، سی.

ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان یەك تا دوو حەب خۆراکی هەر١٢ کاتژمێر بۆ ماوەی ١٤ ڕۆژ، منداڵان ٤٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش دابەشکراو بۆ دوو ژەم.

بەکارنەهێنان: هەستیاری دەرمان، منداڵەکانی کەمتر ٢مانگ، نارێکی گورچیلە، فارنژیت (قورگ ئێشە).

● زیانە لاوەکییەکان: لیر، هێڵنج، سکچوون، سەرلێشێوان، سەرئێشە، زەردوویی.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی بەکارهێنانی دەرمان شلەمەنییەکی زۆر بەکاربهێنرێت.

– لەحەبی دژی سکپڕی بۆ رێگرتن لەسکپڕی سوود وەرنەگرن.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەهەر چەشنە قورگ ئێشە، تا، برینی دەم، ڕەش و شین بوون.

## کرۆمۆلین سۆدیۆم

## CROMOLYN- SODIUM

● ناوی بازرگانی: Intal

● گرووپی دەرمانی: دژی تەنگەنەفەسی، ئەنتی هستامین.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٢٠ ملگم بۆنکردن سپرای لووت، گیراوەکانی بۆن کردن.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیB

● بەکارهێنان لەشیردان: سوودەکانی لەبەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: پێشگرتن لەتەنگی ڕێڕەوی هەوا بەدیهاتوو لە وەرزشکردن، پێشگرتن لە پەلامارەکانی تەنگەنەفەسی، پێشگرتن و چارەسەری ئالوزژی و هەستیاری وەرزی.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ چارەسەری تەنگەنەفەسی وەرزشی یەك دوزسپرایا کەپسوول یەك کاتژمێر پێش وەرزش.

پێشگرتن لەتەنگەنەفەسی: یەك کەپسوول ٣تا٤ جار لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری لە ڕاددەبەدەر، ناهاوسەنگیەکانی خوێنەری کرۆنری، تەنگەنەفەسی توند.

زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، هێڵنج، رشانەوە. وشك

بوونی دەم، سووتانەوە ڕێرەوی میز، زۆر میزهاتن، ژانی سك، ئاوسانی غودەی ژێر شەویلگە.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەوانەیە کاریگەری چارەسەری دەرمانەکە درەنگ بەدەرکەوێ.

– ئەگەر سوود لە سالبوتامول وەرگرن ٥ خولەك پاش سوود وەرگرتن کرۆمۆلین وەرگرن.

– بۆ چاککردنەوەی تامی نەخۆشی دەم ئاو غەرغەرەبکرێت.

## کرۆتامیتۆن CROTAMITON

● ناوی بازرگانی: Eurax

● گرووپی دەرمانی: دژی گرۆێتی

● شێوەی دەرمانی: کرێمەکانی ١٠٪

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان لەشیردان: سوودەکانی لەبەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری نەخۆشی گرووێتی.

ڕێژەی بەکارهێنان: پاش خۆشوشتنو وشککردنەوەی پێست، لەسەر پێست لە ملو یان پەنجەکانی پێ بە کرێمەکان دا بماڵدرێن. بەتایبەت لەشوێنەکانی لۆچ. ئەم کارە ٢٤ کاتژمێر پاش جارێکی تر دووبارە بکرێتەوە ٤٨ کاتژمێر پاش جاری کۆتایی بەکارهێنان نەخۆش دەبێت خۆی بشوات.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بەدەرمان، هەوکردنی پێست لەشوێنەکانی قلێشداری پێست، برینەکانی گەورە سەر پێڵووی چاو، سەروپرچ.

● زیانە لاوەکییەکان: خورانو ورژاندنی پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– گشت جلو بەرگەکان پاش شوشتن بۆ ماوەی ٢٠ خولەك بە ئوتوو وشك بکرێن.

– چارەسەری ڕێگرتن بۆگشت تاکەکانی خێزان بۆ سوود وەرگرتن لە شامپۆ یا لوسیۆن پێویستە.

– لەوانە خوران بۆ ماوەی ٤ تا ٦ هەفتە درێژەی هەبێت.

– ڕێگرتن لەپەیوەندی دەرمان لەگەڵ چاو و دەم.

– گۆڕینی جلو بەرگو کەلوپەلی نووستن بەیانیان پاش چارەسەری.

– لەکاتی پەیوەندی دەرمانەکە لەگەڵ چاودا بە ئاوێکی زۆر چاو بشۆردرێت.

## سپیرۆهپتادین CYPROHEPTADINE

● ناوی بازرگانی: Periaction

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی هستامین، هێمن کەرەوەی جوولێنەری ئارەزووی خواردن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٤ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی B

بەکارهێنان لەشیردان: رانەسپێردراوە.

بەکارهێنان: خوران، لیر، چارەسەری یارمەتیدەر لەمیگرین (ژانەسەر) زیادکردنی ئارەزووی خواردن.

ڕێژەی بەکارهێنان: پێگەیشتووان: یەك حەب ٣تا ٤ جار لەڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: تەنگەنەفەسی هەستیاری لە ڕاددەبەدەر، ساوایان و شیرخۆرەکان و بەتەمەنەکان، گیرانی ملی میزڵدان.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، سەرئێشە، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، کەم خوێنی، کەمبوونی پلاکت. وشك بوونی دەم، قەبزی، تاریك بینین، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول و دەرمانەکە لەیەك کاتدا.

– ئاگادارکردنەوەی پزیشك لەهەر چەشنە پاڵەپەستۆ و سەرسووڕان.



## DANAZOL دانازول

- ناوی بازرگانی: Danocrine
- گرووپی دەرمانی: هۆرمۆن (ئاندرۆژن)
- شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ١٠٠و ٢٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیX
- بەکارهێنان لەشیردان: ڕانەسپێردراوە

بەکارهێنان: نەخۆشی ئاندو مێترۆز، ڕێگرتن لە ئانژیوادم، نەخۆشی فیبرۆکیستیکی مەمك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠٠ تا ٤٠٠ ملگم بۆماوەی ٣ تا ٩ مانگ.

بەکارنەهێنان: ناتەواوی جگەر، گورچیلە، دڵ، خوێن بەربوونی ناسروشتی منداڵدان.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، خەمۆکی، هێڵنج، خوێن بەربوونی منداڵدان، ناهاوسەنگی لەبینین، زەردەیی، ناهاوسەنگی کارکردنی جگەر، زیادبوونی موو، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

- نابێت دەرمانەکە لەناکاو رابگیرێت.
- پشکنینی مەمك دەبێت لەلایەن خودی تاکەکە بکرێت و هەرچەشنە زیادبوونی گرێکە بەپزیشك ڕابگەیەنرێت.
- لەماوەی چارەسەرکردندا لەشێوازەکانی سکپڕی ناهۆرمۆنی سوود وەربگیرێ.
- سووڕی مانگانە ٢ تا ٣ مانگ پاش ڕاگرتنی دەرمانەکە دەکرێ ڕووبدات.

**دفرۆکسامین DEFEROXAMINE**

- ناوی بازرگانی: Desferal
- گرووپی دەرمانی: لابەری ئاسنی لەش
- شێوەی دەرمانی: ڤیالەکانی ٥٠٠ ملگم
- بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپیC
- بەکارهێنان لەشیردان: ڕاپۆرتێکی ڕێكو پێك لەبەردەست دانیە.

بەکارهێنان: ژارانگەزی توندو درێژخایەنی ئاسن همۆکرۆماتۆز (کۆبوونەوەی ئاسنی زیادە لەپێکهاتەکان) لەنەخۆشەکانی تالاسیمایی کەخوێنێکی زۆر وەردەگرن.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك.

بەکارنەهێنان: ناتەواوی توندی گورچیلە، منداڵانی تەمەن کەمتر لە ٣ساڵ

- زیانە لاوەکییەکان: دەرزی لێدانی خێرا لە نا دەمار دەبێتە هۆی پەچەکرداری هەستیاری. خووران، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، سکچوون، تاریك بینین، زیانەکانی بیستن، ژانی پێ، سووتانەوەی ڕێڕەوی میز.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئاگاداركردنی پزیشك لەگۆڕانکارییەکانی بینین.
- میزی نەخۆش ڕەنگی دەگۆڕێ.
- دەرزی لێدانی ماسوولکەیی‌و ژێرپێست بە ژانە.
- بێ ڕاسپاردنی پزیشك سوود لە ڤیتامین C وەرنەگیرێ.

**دگزامتازۆن DEXAMETHASONE**

- ناوی بازرگانی: Decadrol
- گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن، ئادرنۆکۆرتیکۆئید.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٠.٥ ملگم، ئەمپوولەکانی ٨ ملگم. دڵۆپی پاککەرەوەی چاو.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی ٢ (لە سێ مانگی یەکەمی سکپڕی گرووپی d).

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بدرێت.

بەکارهێنان: پەچەکردارەکانی زۆری هەستیاری هەوکردن لە هەر بەشێکی لەش، هێڵنج‌و ڕشانەوە بەدیهاتوو لە

چارەسەری کیمیایی. چارەسەری یارمەتیدەر لە هەوکردنی پەردەکانی دەماغ ئاوسانی دێرەکانی هەوا.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە هەوکردنی دەماغدا، یەك یا٢ ئەمپوول هەر ٦ تا ١٢ کاتژمێر.

لە مننژیت (هەوکردنی پەردەی دەماغ) بەدیهاتوو لە ئازارەباریکە، ٨ تا ١٢ ملگم ڕۆژانەو کەمکردنی هێواش هێواش لە ماوەی ٦ تا ٨ هەفتە.

بەکارنەهێنان: هەوکردنی کەڕوویی لە لەشدا.

● زیانە لاوەکییەکان:

برینی گەدەو دواتر دەگرێ. بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی ناو چاو، ئاو مرواری، لاوازیو ئاترونی ماسوولکەکان. زیادکرنی گریمانەی هەوکردن، بەرزکردنی شەکرەی خوێن، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، بێ ئۆقرەیی، سەرئێشە، بێ خەوی.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە ڕاگرتنی دەرمان ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژ بەکارهێنرابێت.

- ئاگادارکردنەوەی پزیشك لە هەر چەشنە هێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن. شەکەتی- لاوازی، ژانی جومگەکان، چونکە دەتوانێت هێماکانی ناتەواوی ئادرنال بێت.

**دێکس پانتنۆل** dexpanthenol

● گرووپی دەرمانی: دژی کۆکە، دژی میزگیران (احتقان).

● شێوەی دەرمانی: شەربەت

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C

● بەکارهێنان لە شیردان: نەسەلمێندراوە

بەکارهێنان: کۆکەی وشك

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ١٠ سی سی هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

منداڵان: ٢.٥ تا ٥ سی سی هەر ٦ تا ٨ کاتژمێر ڕۆژانە.

بەکارنەهێنان: کۆکەی بەڵغەمدار - منداڵانی بچووکتر لە ٢ ساڵ

● زیانە لاوەکییەکان:
هێڵنج، ڕشانەوە، ژانی سک، خەواڵوویی.
پارێزگارییەکان: تەنگەنەفەسیی - هەبوونی ئالدژی توند هەستیاری بە ئەسپیرین.
فێرکردنی نەخۆش:
- بەکارهێنانی دەرمان چەند کاتژمێر بەر لە نووستن، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی بێ خەوی.
- زیاتر لە ڕاددەی پێویست بەکارنەهێنرێت.
- ئاگادارکردنەوەی پزیشك ئەگەر کۆکەکە زیاتر لە ٧ ڕۆژ بخایەنێت.
- ڕەچاوکردنی ئەمانەی خوارەوە: خۆپاراستن لە جگەرەکێشان، سوود وەرنەگرتن لە بۆن، ئامادەنەبوون لەو شوێنانەی کە پڕن لە کا و تۆز.

دیازپام diazepam

● ناوی بازرگانی: Valium
● گرووپی دەرمانی: دژی پەشێوی. هێمن کەرەوە. شلکەری ماسوولکەکانی، لە خێزانی بنزۆدیازپینەکان.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢،٥و١٠ملگم، ئەمپوولەکانی ١٠ ملگم
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیd
بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت
بەکارهێنان: پەشێویو گرژی. ئەسپاسمی ماسوولکە پاش بەکارنەهێنانی ئەلکهول.
ڕێژەی بەکارهێنان: پەشێوی ٢ تا ١٠ ملگم خۆراکی، ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژ ئەسپاسمی ماسوولکەیی، ١٠ ـ ٢ ڕۆژ ٢ تا ٤ جار لە ڕۆژ لە وازهێنان لە ئەلکهول: ١٠ ملگم ٤ ـ ٣ جار لەڕۆژ و پاش کەم بکرێت.
بەکارنەهێنان: هەستیاری لە ڕاددەبەدەر. کۆما ژارانگەزی توندی ئەلکهولی، شۆك.
● زیانە لاوەکییەکان:
سەرسووڕان، سەرئێشە، خەواڵوویی، پەشێوی، نەبوونی هاوسەنگی،

ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، قەبزی، تاری بینین. ناهاوسەنگی لە کارکردنی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– نابێ دەرمانەکە زیاتر لە ٤ مانگ بەکاربهێنرێت بێجگە لەو کاتانەی کە پزیشك رێگابدات.

– سوود لە ئەلکهول وەرنەگیرێ.

– کێشانی جگەرە کاریگەری دیازپام کەم دەکات.

– پاش بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی درێژ نابێ دەرمانەکە لەناکاو نەخورێت.

– خەوالوویی لە سەرەتای بەکارهێنانی دەرمان زیاترە.

– لە بەکارهێنانی پێستی گریمانەی دابەزینی پالەپەستۆی خوێنو وەستانی هەناسە لە ئارادایە.

## دیکلۆفناك سۆدیۆم diclofenac sodium

● ناوی بازرگانی: Voltaren

● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن– نائستروئیدی، دژی ئێش، دژی تا.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و ٥٠و ١٠٠ ملگم، فتیلەکانی ٥٠و ١٠٠ ملگم، ئەمپوولەکانی ٧٥ ملگم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕی دا: گرووپیb (لە سێ مانگی کۆتاییدا گرووپیd).

بەکارهێنانی لە شیردان: سوودەکانی لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: ئارتروز ـ دژی ئێش.

ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدراوە بە نەخۆشی ٢٥ تا ٢٠٠ ملگم لە ژەمەکانی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: برینی گەدەی ئەکتیف، هەستیاری پێشینەی تەنگەنەفەسی یان پەرچەکردارەکانی زیادبوونی هەستیاری بەدیهاتوو لە ئەسپیرین.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، گرژی، ناهاوسەنگی یادگە،

بەرزبونی پاڵەپەستۆی خوێن. لیر، سکچوون، قەبزی، ژانەکانی سك، تاری بینین، کەمبوونی بیستن، گیرانی شلەمەنیەکان، تەنگە نەفەسیی، کەمبوونی شەکری خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمانەکە ورد نەکرێ.

– بە مەبەستی کەمبوونی هێماکانی هەرسکردن دەکرێ دەرمانەکە بە شیر یان لەگەڵ خۆراك بەکاربهێنرێت.

– ئاگاداركردنی پزیشك لە كاتی بەدەرکەوتنی هێماکانی وەکو ئەنفلۆنزا ـ هێڵنجو ڕشانەوە، زەردەیی خەواڵوویی و خوران.

– بەکارهێنانی دەرمانە بەشێوەی لێدانی دەرزی بەهۆی ئیفلیجی دەماری سیاتیك لە ولاتی ئێران قەدەغەکراوە.

– خۆپاراستن لە کاری لێخوڕی بەهۆی خەوهێنەری دەرمانەکە.

## دی سیکلومین

## dicyclomine

- ناوی بازرگانی: Dilomine
- گرووپی دەرمانی: دژی ئێشی ئەنتی کولینرژیك، دژی ئسپاسمی کۆئەندامی هەرس.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۱۰ ملگم. شەربەتەکانی ۱۰ ملگم لە ٥ سی سی. ئەمپوولەکانی ۲۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیb.
- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.
- بەکارهێنان: چارەسەری یارمەتیدەر لە برینی گەدەدا کولیك (سك ئێشەی منداڵان) نارێکی وەڕەزکەری ڕیخۆڵەکان.
- ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ۱۰ تا ۲۰ ملگم خۆراکی ۳ تا ٤ جار لە ڕۆژ.

منداڵان: ٥ تا ۱۰ ملگم خۆراکی ۳ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: هەستیاری، گرژی، گیرانی کەناڵەکانی کۆئەندامی هەرس، برینی

گـەورە، لێخـوڕینی ئۆتۆمبێـل، بـەرزی پاڵەپەسـتۆی خـوێن، نەخۆشـی شاخوێنبەر.

- زیانــە لاوەکییــەکان: سەرئێشــە، سەرسووڕان، لێدانی دڵ، قەبزی، وشکی دەم، تاری بینین، گیرانی میز ـ تا ـ بیّ خەوی.

پارێزگاریــەکان: پرکــاری تیرۆئیــد. نەخۆشی دەمارەکانی کروند، ناتەواوی دڵ، نەخۆشی گورچیلەو جگەر، گەورەیی پرۆستات.

فێرکردنی نەخۆش:

- نابێ ژەمی بەکارهێنانی دەرمانەکە دوو بەرابەر بکرێت.
- خۆپاراستن لـە گـۆڕینی بـارودۆخی لـەناکاو بـەهۆی گریمانــەی دابــەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.
- خۆپاراستن لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستی بەوردبینی هەیە.

## DIGESTIVE دایجستیو

- ناوی بازرگانی: Onoton
- گرووپــی دەرمــانی: ئــانزیمی هەرسکردن.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی هەڵگری پانگراتین، لیپاز، همی سلولز.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بــەکارهێنان لــە شــیردان: بــەوریایی بەکاربهێنرێت.

بــەکارهێنان: ناهاوســەنگی هەرســکردن. بەد هەرسکردن، سك ئاوسان، پانکراتیتی درێژخایەن، سکچوونێکی درێژخایەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب هاوڕێ لەگەڵ هەر ژەمێکی خواردن.

بەکارنەهێنان: هەستیاری لە ڕاددەبەدەر، پانکراتیتی توند، ناتەواوی جگەر، گیرانی ڕێڕەوەکانی زەرداو.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، ژانەکانی سك، گیرانی ڕیخۆڵە، زیادبوونی ئەسیدئوریکی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

- پەیوەندی بە ئەنتی ئەسیدەوە هەیەو نابێ پێکەوە بدرێن.
- لەدوای بەکارهێنانی دەرمانەکە پەرداغێك ئاو یان پەرداغێك ئاوی میوە بخورێتەوە.
- کاتی بەکارهێنانی دەرمانەکە لەو خواردنە سوود وەربگرن کە چەوری کەمە.

## دیگۆکسین DIGOXIN

● ناوی بازرگانی: Lanoxine

● گرووپی دەرمانی: دژی ئاریتمی (ناهاوسەنگی لێدانی دڵ، چارەسەری گرژبوونی گوێچکەکانی دڵ).

● شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ۰.۲۵ ملگم، ئەمپوولەکانی ۰.۵ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: نارێکی دڵ. ناهاوسەنگی لێدانی دڵ (فیبریلاسیون) خێرالێدانەکانی دڵ، پەك کەوتنی دڵ، سنگەکوژێی توند پاش نەشتەرگەری دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: لە دەسپێکدا۰.۵ تا یەك ملگم خۆراکی یا دەرزی لێدانی پێستی ڕۆژانە لە ژەمەکانی دابەشکراوو ژەمی ڕاگر ۰.۱۲۵ تا ۰.۵ ملگم ڕۆژانە (باشتر وایە هەر هەفتە ۲ڕۆژ بەکارهێنانی دەرمانەکە ڕابگیرێ).

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر بەخۆی هێماکانی ژارانگەزی بە دیگوکسین (ژمارەی ترپەکانی لە خوارەوەو ڕێكو پێك) نەخۆش شتەکانی دەوروبەر بە ڕەنگی زەردببینی. هێڵنجو ڕشانەوە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێڵنج، ڕشانەوە،تاری بینین، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، زیادکردنی نارێکی دڵ، سەرسووڕانو ڕاوە. کەمبوونی ئارەزووی خواردن.

فێرکردنی نەخۆش:

- دەرمانەکە نابێ لە ناکاو ڕابگیرێ.
- ئاگادارکردنەوەی پزیشك لە: کورتی هەناسە، تەنگە نەفەسی، زیادکردنی کێش، کۆکەی بەردەوام، پەیدابوونی بینینی زەرد، خەمۆکی. ئێشی بەشی خوارەوەی گەدە، خەوالۆویی، سکچوون، وازی.

**دی هیدروارگوتامین**

dihydro ergotamine

● ناوی بازرگانی:Migranal

● گرووپی دەرمانی: گرژکەری دەمارەکانی موحیگیو دەماغ.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢.٥ ملگم، ئەمپوولەکانی ١ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان:سەرئێشەکانی سەرچاوەگرتووی دەماری (میگرنو کلاستر).

● ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٣ ملگم خۆراکی کە هەر ٣٠ خولەکێك تا ڕێژەی ١٠ملگم کاتی سەرئێشە دەکرێ دووبارە بکرێتەوە.

بەکارنەهێنان: هەستیاری زۆر، گیرانی دەمارەکان. نەخۆشی دڵو گورچیلەو جگەر، برینی گەدە. بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، منداڵان.

● زیانە لاوەکییەکان:

هێڵنج، ڕشانەوە، زیادکردنی ترپەکانی دڵ. ناهاوسەنگی بینین. وشکی دەم ئاوسانی دەستو پێ.

ناهاوسەنگیەکانی دەرمانی: بەکارهێنانی هاوکاتی ئریترومایسینو پروپرانولولو ئانتولول ڕاناسپێردرێت.

فێرکردنی نەخۆش: – پاش بەکارهێنانی دەرمانەکە نەخۆش لە ژوورێکی تاریكو ئارام پشوو بدات.

– خۆپاراستن لە کێشانی جگەرەو نابێ نەخۆش لە شوێنی سارد دابێت.

– نابێ دەرمانەکە لەبەر دەستی منداڵان بێت چونکە دەبێتە هۆی مەرگ.

**دیلتیازیم dilthiazem**

● ناوی بازرگانی: Cardizem

● گرووپی دەرمانی: بلۆك كەری كەناڵی كالیسیۆم دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٦٠ و ١٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری پاڵەپەستۆی خوێن، نەخۆشی دەمارەکانی دڵ، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، سنگە کوژێ، سنگە کوژێی درێژخایەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: لەنەخۆشی دڵ، بە ٣٠ ملگم ٤ جار لە ڕۆژ دەست پێدەکرێتو پاشان تا ١٨٠ تا ٣٦٠ لە ڕۆژدا زیاد بکرێت.

لە پاڵەپەستۆی خوێندا: ١٨٠ تا ٢٤٠ ملگم ڕۆژانە دەدرێت.

بەکارنەهێنان: دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن. ناڕیکی لە ماسوولکەو چالاکی دڵ، ناتەواوی سییەکان بەکارنایەت لەگەـ سایکلوسبورینو دیجوکسین.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە سەرسووڕان، خەمۆکی، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن. ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، هێڵنج، ڕشانەوە، ترس لە ڕووناکی، خوێن بەربوون، کەمبوونی ئارەزووی خواردن.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لەو چالاکیانەی کە پێویستی بەوشیاری هەیە چونکە لەوانەیە ئەم دەرمانە ببێتە هۆی سەرسووڕان.

– ئاگادارکردنی پزیشك لە کاتی کورتی هەناسە. ترپەی دڵ، سەرسووڕان.

– کۆنترۆڵ کردنی پاڵەپەستۆی خوێنی نەخۆش.

## دایمن هایدرینات
## DIMENHYDRINATE

- ناوی بازرگانی: Dramamine
- گرووپی دەرمانی: دژی وەرگری H1.
دژی هەستیاری. دژی سەرسووڕان.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B
بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.
بەکارهێنان: هێڵنجو ڕشانەوە، نەخۆشی منیر(ناهاوسەنگی هاوتایی بەهۆی کێشەی گوێ ی ناوەوە. ڕێگرتن لە هێڵنجو ڕشانەوە بەدیهاتوو لە نەخۆشی جووڵە( هێڵنج کاتی سەفەرکردن).
ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژ، بۆ ڕێگرتن لە نەخۆشی جووڵە باشترە دەرمان نیو کاتژمێر بەر لە حەرەکەت کردن بەکاربهێنرێت.
بەکارنەهێنان: گەورەیی پرۆستات لە پیاوان دا، بەرزبوونەوەی فشاری ناو چاو.
- زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی - لاوازی گشتی. سەرئێشە، سەرسووڕان، وشک بوونی دەم، قەبزی. سووتانەوەی ڕێڕەوی میز، کەم بوونەوەی ئارەزووی خواردن.
فێرکردنی نەخۆش:
– خۆپاراستن لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستی بە وشیاری هەیە.
– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهولو لاوازکەرەکانی دەماغ.

## dimethicon دایمتیکون

- ناوی بازرگانی: Mylicon،Degas
- گرووپی دەرمانی: چارەسەریو نەهێشتنی غازات لە کۆئەندامی هەرس.
- شێوەی دەرمانی: حەبو دڵۆپی ٤٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
بەکارهێنان لە شیردان: لەژێر چاودێری پزیشك.
بەکارهێنان: ئاوسانی سك لەبەر هەرسکردن دا، برینی گەدە، دیورتیکولیت پاش نەشتەرگەری.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ حەب لە ناوەندی خۆراك بجودرێن.

بەکارنەهێنان: نیەتی.

- زیانە لاوەکییەکان: زیانێکی تایبەت نەبینراوە.
- فێرکردنی نەخۆش:

– حەبەکان دەبێ بجودرێن.

**دیفن هیدرامین diphenhydramin**

- ناوی بازرگانی: Benadryl
- گرووپی دەرمانی: هێمن کەرەوە. دژی هەستیاری.
- شێوەی دەرمانی: شەربەتو حەب ٢٥ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: ئاوهاتن لە لووتو هێماکانی هەستیاری نەخۆش جوولە. پارکینسون، سەرسووڕانو هێڵنج.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ٢٥ تا ٥٠ ملگم هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر لانی زۆر تا ٤٠٠ ملگم لەڕۆژدا.

مندالآن: ٥ ملگم بۆ هەر کیلۆگرامی کێشی لەش لە چوار ژەمی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: تەنگەنەفەسی توند، پورفیری.

- زیانە لاوەکییەکان: خەوالّوویی - سەرئێشە - سەرسووڕان. بێ ئۆقرەیی. تا. ترپەدڵ. دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن. وشکبوونی دەم، گیرانی میز، کەمبوونی ژمارەی خڕۆکەکانی سپی.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستیان بە وشیاری هەیە.

– لەوانەیە هەستیاری بە رووناکی رووبدات.

دیفنوکسیلات diphenoxylate

● ناوی بازرگانی: Lomotil
● گرووپی دەرمانی: سڕکەر - دژی سکچوون.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢.٥ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: سکچوونەکانی درێژخایەن. بۆ چارەسەری سکچوون بەدیهاتوو لە وازهێنانی مادده سڕکەرەکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ ملگم هەر ٦ کاتژمێر (٢حەب) کەبە کەمبوونی سکچوونەکە کەمتر دەبێت.

بەکارنەهێنان: سکچوونی بەدی هاتوو لە میکروبو یا هەوکردنی ڕیخۆڵەی ئەستوور.

● زیانە لاوەکییەکان: وشکبوونی دەم. قەبزی. سک ئێشە. سەرخۆسی، خەواڵوویی - خوران. هەوکردنی پانکراس (پانکراتیت) میزگیران. زیادبوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

١- وەلآمدانەوە بە دەرمان لە ماوەی ٤٨ کاتژمێر دەست پێ دەکات. بەپێچەوانەوە نابێ دەرمانەکە بەکاربهێنرێت.

٢- لەکاتی هەبوونی تا یان سکچوون خوێنی نابێ بدرێت.

دی بیریدامول dipyridamole

● ناوی بازرگانی: Persantine
● گرووپی دەرمانی: والآکردنەوەی دەمارەکانی کرونر، دژی کۆبوونەوەی پلاکت.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و ٧٥ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: بەرگرتن لە پەلاماری کەمبوونی خوێن گەیشتنی دەماغ، مەهاری کۆبونەوەی پلاکتو بەرگرتن لە دڵەوەستێی دووبارە پاش دانانی دەرچەی دەستکرد بۆ بەرگرتن لە ترومبوز. لەئسکنی دڵ سوودی لێ وەردەگیرێ.

● ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ بەرگرتن لە mi/ی دوبارەو دەرچەی دەستکرد٧٥ تا ١٠٠ ملگم ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار لەڕۆژ هاورێ لەگەڵ ئەسپیرین.

بەکارنەهێنان: دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، منداڵانی خوار ١٢ساڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە. سەرسووڕان ـ گرگرتن. هێڵنجو ڕشانەوەو کەمبوونی ئارەزووی خواردن.

فێرکردنی نەخۆش:

– بەسکی بەتاڵ (ئەخرین) بخوردرێت.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

– بۆ بەرگرتن لە دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن بە وریایی بارودۆخەکەتان بگۆڕن.

## دۆکسی پین doxepine

● ناوی بازرگانی: Adopin

● گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی، دژی ئێش.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ و ٢٥ ملگم، شێوەی کەپسوولیش بوونی هەیە.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنانی لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: خەمۆکی، پەشێوی. ئێشەکانی درێژخایەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٣ حەب یان کەپسوول ڕۆژانە لە ژەمەکانی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر گەورەیی پرۆستات. میزگیران.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، سەرئێشە، نەبوونی هاوسەنگی، وشك بوونی دەم، قەبزی، هێڵنج، ڕشانەوە، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، وزەوزی گوێ، تاری بینین، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

- کاریگەری دژی خەمۆکی دەرمان ٢ تا ٣ هەفتە دەخایەنێ تا بەدەرکەوێ.
- سوود لە ئەلکهول وەرنەگیرێ.
- لەکاتی بەکارهێنانی درێژخایەنی دەرمان، نابێ بەکارهێنانی دەرمان لە ناکاو رابگیرێ.

## داکسی سایکلین doxycycline

● ناوی بازرگانی: Vibramycin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك.

● شێوەی دەرمان: کەپسوولەکانی ١٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی D.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: هەوکردنی توندی سوزەنەكو سفلیس (فەرەنگی) هەوکردنەکانی بۆڕیەکانی منداڵدان، سکچوونی سەفەر، هەوکردنی سی، چارەسەری زیپکەی دەمو چاو.

ڕێژەی بەکارهێنان: یەك کەپسوول لە هەر ١٢ کاتژمێر بۆ ماوەی ١٠ تا ١٤ ڕۆژ.

بەکارنەهێنان: منداڵانی تەمەن کەمتر لە ٨ ساڵ، برینی گەدەو ڕیخۆڵە. گرژی.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوون، گۆڕانی ڕەنگی ددان لە منداڵان، قورتدانی دەردناك، هەوکردنی دەم.

فێرکردنی نەخۆش:

- دەرمان دەبێ بە پەرداغێك ئاو بخوردرێتو تاکەکە نابێ تا یەك کاتژمێر خۆی درێژ بکات.
- بایەخ بە سکچوون بدرێت.

٣ـ خۆپاراستن لە پەیوەندی لەگەڵ خۆردا.



enalapril ئەنالاپریل

● ناوی بازرگانی: Vasotec

● گرووپی دەرمانی: کۆنترۆلکاری ئانزیم بگۆڕێ ئانژیوتانسین دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥و ٢٠ ملگم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C (لە سێ مانگی دووەمو سێیەمی سکپڕی گرووپی d).

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: بەرزبوونی پاڵەپەستۆی خوێن سوك یان توند. چارەسەری یارمەتیدەر بۆ نارێکی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە سەرەتادا بە ٥ ملگم ڕۆژانە یەك جار دەست پێ دەکرێتو پاشان بەپێی پێویستی زیاد دەکرێت.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توندی دەرمان.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە - سەرسووڕان. دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن. سکچوون. کۆکەی وشك. کەمبوونی ئارەزووی خواردن. ئادم/ی دەمو چاو. زیپکەی پێست.

پارێزگارییەکان: ناتەواوی لە کارکردنی گورچیلە، بەکارهێنانی دەرمانەکانی میز هێنەر. تاکەکانی بە تەمەن.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگاداركردنی پزیشك لەكاتی سەرهەڵدانی برینەکانی دەم، قورگ ئێشە، تا، ئاوسانی دەستو پێ، ترپەکانی نارێكو پێکی دڵ.

– کۆکە لە زیانەکانی بەلاوی ئەم دەرمانەیە کە لە کاتی توند بوونی دەبێ دەرمانەکە بگۆڕدرێت.

– بەکارهێنانی دەرمان نابێ لە ناکاو ڕابگیرێ.

## ئنوکساپارین enoxaparin

- ناوی بازرگانی: Levenox
- گرووپی دەرمانی: دژی بەستن‌و مەین.
- شـێوەی دەرمـانی: ئەمپوولـەکانی ۲۰و٤۰و ٦۰و ۸۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.
- بـەکارهێنان: ڕێگـرتن لـە پەیـدابوونی مەین لە دەمارەکان، چارەسـەر بـۆ مـەین لە دەمارەکان.
- ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ بەرگرتن ۱ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لـەش ڕۆژانـەو بـە مەبەسـتی ئامانجـەکانی چارەسـەرکردن ۱ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لـەش هـەر ۱۲ کاتژمێر.

بەکارنـەهێنان: کـەمبوونی ژمـارەی پلاکتـەکانی خـوێن، خـوێن بـەربوونی چالاك.

- زیانە لاوەکییەکان:

خـوێن بـەربوون، ئـێش‌و سـووربوون لـە شوێنی دەرزی لێدان. هێڵنج ـ کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکانی خوێن، تا.

فێرکردنی نەخۆش:

– لە ڕێگەی ماسوولکە نابێ لێبدرێت.

– شـوێنی دەرزی لێـدان. باسـك، بەشـی ڕاسـت‌و چـەپی دیـوارەی پێشـەوەو بەشـەکانی ڕاسـت‌و چـەپی دیـوارەی پاشەوەی سك.

– گشت درێژایی دەرزی دەبێ ببرێتە نـاو بەشـێکی پێسـت کـە لـە نێـوان پەنجـەی ئەسپێ کـوژەو بالآبـەرزەی دەرزی لێـدەر هەڵدەکەوێ.

## ئپی نفرین epinephrine

- ناوی بازرگانی: Adernlin
- گرووپـی دەرمـانی: بەرزکـەرەوەی پالەپەستۆی خوێن.
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوول ۱\۱۰۰۰

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بـەکارهێنان: دڵەوەسـتێ‌و شـۆکی بـەدیهاتوو لـە هەسـتیاری دەرمـانی یـان تەنگەنەفەسی.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: سـەرەتا ۰.۱ تـا ۰.۵ ملگم ژێـر پێست یـان ماسـوولکەییو لـە کاتی پێویست بـە مـەوداکانی هـەر ۱۰ تـا ۱۵ خولەکێك دەکرێ دووبارە بکرێتەوە.

بـــــــەکارهێنان: نەخۆشـــــــی دڵ، ناهاوســـەنگییەکانی لێـدانی دڵ، شـــۆك (بێجگە لە شۆکی بەدیهاتوو لە زیـادبوونی هەستیاری.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، سەرسـووڕان، بــێ خـــەوی، ئاوســـان، ناهاوســـــەنگییەکانی لێـــــدانی دڵ، بەرزبوونـــەوەی پاڵەپەســـتۆی خـــوێن، هێڵنج، ڕشانەوە، تاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـــادارکردنی پزیشـــك لـــە تەنگـــە نەفەسیو ژانی سینگ.

– نـــابێ لـــەخۆوە ئـــەم دەرمانـــە بەکاربهێنرێت.

ergotam[n – c ئرگوتامین – سی

● ناوی بازرگانی: Ergo – Caff

● گرووپـی دەرمـانی: تەسـك کـەرەوەی دەمارەکان، دژی میگەرن.

● شـێوەی دەرمـانی: حـەب هـەڵگری ۱ ملگم ئرگوتامینو ۱۰۰ ملگم:

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

● بـــەکارهێنان لەشـــیردان: بـــەوریایی بەکاربهێنرێت.

● بەکارهێنان: بـۆ چارەسـەرىو ڕێگـرتن لە سەرئێشەکانی دەماری وەکو میگەرنو سەرئێشەکانی هیشوویی.

● ڕێـژەی بـەکارهێنان: لـەکاتی هـەبونی سەرئێشە ۲ حەب بخوردرێت دەکرێ هـەر نیوکاتـژمێر یـەك بەکاربهێنـدرێت. لانـی زۆری بەکارهێنانی لە هەر پەلەماردا.

● بەکارنـەهێنان: هەسـتیاری تونـد بـە پێکهاتـەکانی ئرگـوتو کـافئین نـارێکی جگەرو گورچیلە. نەخۆشی دەمارەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: بێ هەستیو تەزینی پەنجەکان، خوران، ئێشی سینگ، هێڵنج، سکچوون، ئاوسانی ئەندامەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگاداركردنی پزیشك لە ساردی ئەندامەکان یان تەزینو لاوازی ئەندامەکان، چونکە لەوانەیە بەهۆی گرژبوونەوەی دەماری بێت.

– لە پیاسەکردن یان چالاکی نواندن لە هەوای سارد خۆتان بپارێزن.

ئریترومایسین erythromycin

● ناوی بازرگانی: Erythrocin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۲۰۰و ٤۰۰ ملگمو شەربەتی ۲۰۰ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیb

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بە کاربهێنرێت.

بەکارهێنان: هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە قورگ، گوێو سی، کۆکەڕەشە، سوزەنەك تای ڕۆماتیزمی.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان:

لەهەوکردنەکانی هەناسەی سەرەوە ٤۰۰ تا ۸۰۰ ملگم لە هەر ٦ کاتژمێردا.

مندالآن:

۳۲ تا ۸۰ ملگم بۆ هەر کیلۆگم کێشی لەش ڕۆژانە لە ۳ تا ٤ ژەمی دابەشکراو.

بەکارنەهێنان: ناتەواوی جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: کەمبوونی بیستن، هێڵنج، لیر، سکچوون.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمانەکە لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

– خۆپاراستن لە وردکردنی دەرمانەکە.

– نابێ لەگەڵ ئاوی میوە بخوردرێت.

– ئاگاداركردنی پزیشك لە کاتی سەرهەڵدانی هێماکانی خوارەوە: پاشەڕۆی شل. میزی ڕەنگ تۆخ. پاشەڕۆی ڕەنگ پەریو. زەردی چاو یان پێستو ژانەکانی توندی سك.

– ماوەی دەرمانەکە تەواو بکەن.

ئریترۆپۆیتین ERYTHROPOIETIN

- ناوی بازرگانی: Epogen
- گرووپی دەرمانی: هۆرمۆنی دەستکرد بۆ چارەسەری کەم خوێنی.
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ۲۰۰۰، ۴۰۰۰، ۱۰۰۰۰ یەکەیی.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

بەکارهێنان: کەم خوێنی بەدی هاتوو لە نارێکی درێژخایەنی گورچیلە یان نەخۆشانی تووشبوو بە شێرپەنجە.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە نارێکی گورچیلە: ۵۰ تا ۱۰۰ یەکە بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش ماسوولکەیی یان ژێر پێست ۲ جار لە هەفتە لە نەخۆشانی تووشبوو بە شێرپەنجە کە چارەسەری کیمیائیان بۆ دەکرێت ۱۵۰ یەکە بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش هەر هەفتە ۳ جار بۆ ماوەی ۸ هەفتە.

بەکارنەهێنان: پاڵەپەستۆی خوێنی کۆنترۆڵ نەکراو هەستیاری لە رادەبەدەر.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، گرژی، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، لیر - سکچوون، کۆکە ژانی جومگەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئاگادارکردنی پزیشک لە سەرئێشەو تەنگە نەفەسی.
- پاڵەپەستۆی خوێن کۆنترۆڵ بکرێت.

ئسترادیول والرات stradiol valerat

- ناوی بازرگانی: Delestrogen
- گرووپی دەرمانی: هورمونی ئستروژن.
- شێوەی دەرمانی: حەب ۱و ۲ ملگمو ئەمپوولەکانی ۱۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: چارەسەری هێمایەکانو نیشانەکانی ناوەند تا توند دەماریو هورمونی بەدیهاتوو لە زاکەوتن یان

کەمبوونی ئسترۆژن بەدی هاتوو لە هەلگرتنی هێلکەدانەکان. لە شێرپەنجەی ـەمك کە نەشتەرگەری بۆ نەکرێت.
ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی بەکارهێنان جیاوازی هەیە.
بەکارنەهێنان: هەبوونی خوێن مەیین لە دەمارەکانی شێرپەنجە گرێدراو بە ئسترۆژن. خوێن بەربوونی ناسروشتی مندالّدان.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، خەوالّوویی، خەمۆکی، زیادبوونی موو، لیر، گۆڕانکاری لە سووڕی مانگانە، زیادبوونی ڕێژەی شەکری خوێن، هەوکردن و ئاودزکردنی زێ، ئاوسانی سك، هەلّوەرینی قژ.
فێرکردنی نەخۆش:
– لە تاکەکانی تووشبوو بەتەنگەنەفەسیو نەخۆشی دەماری کرونر (دلّ) بە وریایی بەکاربهێنرێت.
– ئاگاداری کردنی پزیشك لە زیادبوونی کێشی لەش و سەرهەلّدانی زیانەکانی سەرەوە.

## ئکسپکتۆرانت expectorant

● گرووپی دەرمانی: بەلّغەمهێنەر ـ دژی کۆکە.
● شێوەی دەرمانی: شەربەت هەلگری گایافنزین، کلرفنیرئامین، فنیل پروپانولامین.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
بەکارهێنان لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.
بەکارهێنان: بۆ چارەسەری کۆکەو گیرانی لووت بەدی هاتوو لە هەلاّمەت. هەستیاریو هەوکردنی هەناسەیی.
ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠ سی سی ڕۆژانە هەر ٦ کاتژمێر.
بەکارنەهێنانی: هەستیاری لە رادەبەدەر.

● زیانە لاوەکییەکان: خەوالوویی - هێلنجو ڕشانەوە.

فێرکردنی نەخۆش:

– سوود وەرنەگرتن لەم دەرمانە ئەگەر تایەکی بەرز یا کۆکەی بەردەوامتان هەیە.

– دەرمانەکە لەگەڵ خواردن یان شیر بەکاربهێنرێت.

ئزتی مایب ezetimibe

● ناوی بازرگانی: Zetia

● گرووپی دەرمانی: مەرهارکەری هەلبژاردەیی هەلمژینی کالسیۆم دژی چەوری خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

بەکارهێنان: لە بەرزبوونی کۆلسترۆل بە تەنیایی یان هاوڕێ لەگەڵ لواستاتین. ئاتۆرواستاتین.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە یەك دەنکە حەب ١٠ ملگم.

بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، نەخۆشی جگەر و زیادبوونی یەکجار زۆری ئانزیمەکانی جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان. شەکەتی لە رادەبەدەر، ئێشی سنگ. سینوزێت، ژانەسك، سکچوون، ژانی جومگەکان، کۆکە.

فێرکردنی نەخۆش:

– هۆکارەکانی مەترسی خولقێنەر دەبێ کەم بن، وەك جگەرە، ئەلکهول، خواردنی چەوری، وەرزش نەکردن.



## famotidine فامۆتیدین

- ناوی بازرگانی: Pesid
- گرووپـــی دەرمـــانی: دژی وەرگـــری هیستامینی h2 دژی چورانی ئەسید.
- شێوەی دەرمانی: حەبـەکانی ۲۰و ٤۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیb.

بـەکارهێنان لــە شــیردان: ســوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمانەکە هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: برینـی گـەدەو دوازدە گرێ، بـەرگرتن لــە گەڕانــەوەی ئەسـید یــان خواردن لە گەدە بۆ سورێنچك.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە چارەسەری برینی گەدە: ٤۰ ملگم بـەر لە نووستن بۆ ماوەی ۱ تا ۲ مانگ.

لەگەڕانەوەی ترشـەڵۆك: ۲۰ ملگم بـەر لـە نووستن.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

- زیانـــە لاوەکییـــەکان: سکچـــوون، سەرســـووڕان، کـــەمبوونی ژمـــارەی پلاکتـەکان، بـێ خـەوی، پەشـێوی، تـا، قەبزی، وزەوزی گوێ.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـــاداركردنی پزیشـــك لـــە: خـــوێن بـــەربوون، شـــین هەڵگـــەڕان، شـــەکەتیو هەستکردن بە ناخۆشی.

– گریمانـــەی کـــەمبوونی ئـــارەزووی سێکسـی بـەم دەرمانـە لـە ئارادایـە، کـە پـــاش بەکارنـــەهێنانی دەرمانەکـــە لادەبردرێت.

– نابێجگـــەرە بکێشـــرێت، چـــونکە کاریگەری دەرمانەکە کەم دەکات.

– خۆپاراسـتن لـە ئەنجامـدانی چـالاکییە وردەکان.

– بۆ بەدەرکەوتنی کاریگەری دەرمانەکـە چەند ڕۆژ کات پێویستە.

## فنوفیبرات fenofibrate

- ناوی بازرگانی:Lofibra،ipofen
- گرووپی دەرمانی: دژی چەوری خوێن.
- شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ۱۳۰و ۲۰۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

*بەکارهێنان لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارنەهێنان: زیادکردنی تری گلیسرید.

ڕێژەی بەکارهێنان: نەخۆشی کیسەی زەرداو. ناهاوسەنگی کارکردنی جگەر، ناهاوسەنگی توند لە کارکردنی گورچیلە.

- زیانە لاوەکییەکان: لاوازی، بیّ خەوی، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، ژانەسك، قەبزی، هێڵنج، هەوکردنی پانکراس، کەم خوێنی - میزی زۆر، ژانی جومگە ـ کۆکە، خوران.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لە ڕوودانی زیانە لاوەکییەکان.

– دەرمانەکە بەتەواوی بەکاربهێنرێت.

## فروس سۆلفات ferrous sulfate

- گرووپی دەرمانی: پێکهاتەی ئاسنی خۆراکی.
- شێوەی دەرمانی: حەب هەڵگری ۰: ملگم. شەربەتو دڵۆپ.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕێپێدراوە.

*بەکارهێنان: کەمبوونی ئاسن.

ڕێژەی بەکارهێنان:

بۆ چارەسەری کەم خوێنیو کەمی ئاسن ۱ حەب ۲ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

لە ڕێگرتن یەك حەب ڕۆژانە سوودی لێ وەربگیرێ.

*بەکارنەهێنان: کۆبوونەوەی ئاسن لە لەش، برینی توندی کۆئەندامی هەرس، لە هەوکردنی جگەر (هپاتیت) بە وریایی بەکاربهێنرێت.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، قەبزی، پاشەڕۆی وەك قیر.

لە سوود وەرگرتن لە دڵۆپ: ڕەشبوونی ددانەکان.

ئیرکردنی نەخۆش:

- سوود وەرگرتن لە ئاسن ڕەنگی پاشەڕۆ بۆ سەوز یان ڕەشی قیراوی دەگۆڕێ.

- پاش بەکارهێنانی دەرمان ١٥ تا ٣٠ خولەکێك لە خۆدرێژکردن خۆتان بپارێزن، چونکە گریمانەی برینی سورێنچك لە ئارادایە.

- دەکرێ دەرمانەکە بە ئاوی میوە بەکاربهێنرێت، بەلآم نابێ بە ئەنتی ئەسید و شیر سوودی لێ وەربگیرێ.

- پاش بەدەرکەوتنی هێماکانی هەرسکردنی دەرمان پاش خواردن بەکاربهێنرێت، بەلآم هەلْمژینی دەرمان کەم دەبێت.

- ئەمانەی خوارەوە پەیوەندییان بە هەلْمژینی دەرمان هەیە: هێلکە بەروبوومی شیرەمەنی. چوکلات، کافئین.

- بەمەبەستی چارەسەری ئانمی ٦ مانگ دەبێ ئاسن سوودی لێ وەربگیرێ.

- لانیکەم یەك کاتژمێر مەودا لە بەینی سوود وەرگرتن لە دەرمانو شیر دەبێ هەبێت.

- بۆ بەرگرتن لە گۆڕینی ڕەنگی ددانەکان دەبێ شەربەتەکە بە قامیش بەکاربهێنرێت.

## فکسوفنادین FEXOFENADINE

- ناوی بازرگانی: Allerga
- گرووپی دەرمانی: دژی وەرگری H1 ، دژی هەستیاری.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٦٠ ملگم (لەئێران).
- بەکارهێنان لە سکپڕی: گرووپیC.
- بەکارهێنان لە شیردان: مەترسیدار نەبوونی ئەم دەرمانە نەسەلمێندراوە.

*بەکارهێنان: هەستیاری وەرزی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢ حەب.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، شـــەکەتی، خـــەواڵوویی، کـــەم بەدهەرسکردن، هێڵنج.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمانەکـە بـە گـەدەی بـەتاڵ بەکاربهێنرێت.

– لەوانەیە ببێتـە هۆی ناهەوسـەنگی لـە لێدانی دڵ.

| | |
|---|---|
| FINASTERIDE | فینارستراید |

● گرووپـی دەرمـانی: مەهارکـەری ٥ ئالفاردوکتاز.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١و ٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا گرووپی X.

● بەکارهێنان لە شـیردان: ئـەم دەرمانـە باشترە لە ئافرەتاندا بەکارنەهێنرێت.

*بـەکارهێنان: بـۆ چارەسـەری گـەورەیی پرۆستات، چارەسەری هەڵوەرینی موو لە پیاوانو زیادبوونی قژ لە ئافرەتان.

ڕێژەی بەکارهێنان: بـۆ هـەڵوەرینی قـژ ١ ملگم بۆ ماوەی ٣ مانگو لە کاتی بەسوود بوونی بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن دەکرێ سوودی لێ وەربگیرێ.

*بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری لـــە ڕاددەبـەدەر لـە میـزگێڕانو ناهاوسـەنگی کـــارکردنی جگـــەر بـــە وریـــایی بەکاربهێندرێت.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: کـــەمبوونی قـەوارەی شـلەمەنی تـۆواو، کـەمبوونی ئارەزووی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

– لانیکەمی ماوەی بـەکارهێنانی دەرمـان ٦ مانگـــەو لـــەکاتی بـــێ کاریگـــەری دەرمانەکە دەبێ نەشتەرگەری پرۆستات ئەنجام بدرێت.

## فلوکونازول FLUCONAZOLE

● ناوی بازرگانی: Diflucan

● گرووپی دەرمانی: دژی کەڕوو.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوول یان حەبەکانی ٥٠، ١٠٠، ١٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: لە گشت چارەسەریدا دەبێ شیردان ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: هەوکردنەکانی کەڕووی دەم، سورێنچك و کۆئەندامی زاوزێ بەتایبەت بە جۆری کاندیدا.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە کاندید یازی زێ: ڕۆژانە ١٥٠ ملگم خۆراکی یەك ژەم.

لە کاندید یا دەمی سورێنچك: ڕۆژانە ٢٠٠ ملگم خۆراکی ڕۆژی یەکەمو پاشان ١٠٠ ملگم کە تا ٢ هەفتە پاش لاچوونی درێژی دەبێت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند بە خودی دەرمانەکە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێڵنج، ڕشانەوە، سووتانەوەی گەدە.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگاداری پزیشك لە کاتی زەردی یا لاوازی توند.

– بە مەبەستی کەمکردنی هێماکانی هەرسکردن دەرمانەکە لەگەڵ خۆراك بەکاربهێنرێت.

– ئەم دەرمانە کاریگەری دەرمانەکانی خۆراکی دابەزێنەری شەکری خوێن زیاد دەکاتو دەبێ ئاگاداری دابەزینی شەکری خوێن بن.

## فلوئۆسینولون FLUOCINOLONE

● ناوی بازرگانی: Fluonex

● گرووپی دەرمانی: کورتون.

● شێوەی دەرمانی: کرێمو مەرحەم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنانی لە شیردان: سوودەکانی ئەم دەرمانە لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی سووکی پێست، هەوکردنی کۆم، ئەکزیمای کۆم، خورانی کۆم، بۆ مایەسیری ناوەوەو دەرەوە، پاش نەشتەرگەری مایەسیری.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٤ جار لە سەر شوێنەکە بمالدرێت.

*بەکارنەهێنان: هەوکردنەکانی کەڕووو میکرۆبی پێست.

● زیانە لاوەکییەکان: خوران- سووتانەوە، ناسکبوونی پێست. وشکی پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– نابێ لە چاو بدرێت.

– پێویست بە بەستن ناکات.

**فلوکستین FLUOXETINE**

*ناوی بازرگانی: Prozac

*گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی.

*شێوەی دەرمانی: کەپسوول ١٠و ٢٠ ملگم.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: خەمۆکی، پرخوری عەسەبی، مودمین بوون بە ئەلکهول.

ڕێژەی بەکارهێنان: بە ٢٠ ملگم ڕۆژانە بەیانیەکان دەست پێ بکرێت و لەکاتی پێویست پاش ٣ هەفتە دەکرێ ژەمی دەرمانەکە زیادبکرێت، لانی زۆر ڕاسپێردراوی دەرمانەکە ٨٠ ملگمە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بە خودی دەرمانەکە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، بێ خەوی، تووڕەبوون، لەرزین - هەڵسوکەوتی پەلاماردان، هێڵنج، سکچوون، وشکی دەم، ژانی سک،

هەوکردنی ڕێڕەوی میز، ناهاوسەنگی لە کاری سێکسی، سووری مانگانەی دەردناك، خوران، لێدانی دڵ، ئێشی جومگە، گیرانی لووت، کۆکە، دابەزینی کێش.

فێرکردنی نەخۆش:

– کاریگەری دەرمانەکە دەتوانی ٤ هەفتە بخایەنێ.

– خۆپاراستن لەبەکارهێنانی ئەلکهول.

– کۆنترۆڵ کردنی شەکرەی خوێن لە نەخۆشەکانی شەکرە پێویستە.

– لەو کاتەی کە دەرمان ببێتە هۆی خەوالّوویی باشترە بەیانیان بەکاربهێنرێت.

**فلۆکسامین** fluvoxamine

● ناوی بازرگانی: Luvox

● گرووپی دەرمانی: دژی وەسواسیو خەمۆکی.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠و ١٠٠ ملگم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنانی لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: ناهاوسەنگی وەسواسیو دژی خەمۆکی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ ملگم لە ڕۆژ کاتی خەو بەکاربهێنرێتو هەر ٤ تا ٧ ڕۆژ ٥٠ ملگم دەکرێ بە ژەمی دەرمان زیادبکرێت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر لە ناهاوسەنگی کارکردنی جگەر بە وریایی بەکاربهێنرێت.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، لەرزین، پەشێوی، بێ خەوی، خەوالّوویی، خەمۆکی، هێڵنج، ڕشانەوە، وشکی دەم، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی، میزگیران، ترپەی دڵ، ئارەقەکردن.

فێرکردنی نەخۆش:

– کاریگەری دەرمان لەوانەیە ٢ تا ٣ هەفتە بخایەنێ.

– لە کاتی قەبزیدا کەرەستەی بەبارست لە خواردندا زیادبکرێت.

**فولیك ئەسید** folicacid

● ناوی بازرگانی: Folvite

● گرووپی دەرمانی: ڤیتامین b9.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١و٥ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی a.

*بـەکارهێنانی لـە شـیردان: سـوودەکانی ئـەم دەرمانـە لـە بەرامبـەر زیانـەکانی هەڵبسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری کەم خوێنی بەدی هاتوو لەکەمبوونی ئەسیدفولیك.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: بـۆڕێگرتن لـە کەمبوونی ئەسیدفولیك لە سکپڕیدا ڕۆژانە یـەك ملگـم لـە کـەم خـوێنی ١ ملگـم بـۆ ماوەی ٤ تا ٥ ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: کەم خوێنی بە دیٚ هاتوو لە کەمبوونی ڤیتامین b12 . کەم خوێنی بە هۆیەکی نادیار.

● زیانـە لاوەکییـەکان: سـووربوونی پێسـت، تەنگـە ڕێـڕەوی هـەوا لـە سـیو سەرهەڵدانی تەنگە نەفەسی.

فێرکردنی نەخۆش:

– بـەکارهێنانی گۆشـت، سـەوزەو میـود زیادبکرێت.

– لەوانەیـە ڕەنگـی میـز بـۆ ڕەنگـی زەرد بگۆڕدرێت.

**فورازۆلیدۆن** furazolidone

● ناوی بازرگانی: Furaxone

● گرووپـی دەرمـانی: دژی لاکـوتو بەکتری.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١٠٠ ملگمو شەربەتەکانی ٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

بـەکارهێنانی لـە شـیردان: مەترسـیدارنەبوونی ئـەم دەرمانـە نەسەلمێنراوە.

*بەکارهێنان: سکچـوونی سـەفەر کـردن، سکچـوونی بـەدیٚهاتوو لـە میکروبـی ژیاردیا.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لەسکچـوونی پێگەیشـتووان: ١٠٠ ملگـم خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژدا.

بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری خـــۆی، بەکارهێنانی لەگەڵ ئەلکهول.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێڵنج، ڕشانەوە، لە کەمبوونی pd6g لەوانەیە ببێتەهۆی لەناوچوونی خڕۆکەکانی سوور.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئـەم دەرمانـە ڕەنگـی میـز قـاوەیی دەکات.

– لـەکاتی چارەسـەری‌و تـا ٤ ڕۆژ پـاش دەبـێ لـە بـەکارهێنانی ئـەلکهول خۆتـان بپارێزن.

– بـــــەکارهێنانی هاوکـــــاتی خواردەمەنیەکانی هەڵگری تیرامین (پـاقلا ـ پـەنیری پاسـتوریزێ نـەکراو، ئـاوجۆ، جگـەری مریشـك‌و بـەروبومی تـورش هەڵگـەڕاو) هاوکـات لەگـەڵ ئـەم دەرمانـە قەدەغەیە.

## فورسمایێد furosemide

- ناوی بازرگانی: Lasix

- گرووپـی دەرمـانی: میزهێنـەر، دژی باڵەپەستۆی خوێن.
- شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ٤٠و ئەمپوولەکانی ٢٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـەکارهێنان: کـۆنترۆڵی باڵەپەسـتۆی خـوێن، ناتـەواوی دڵ، زیـادکردنی کالسیۆمی خـوێن، ناتـەواوی درێژخایـەنی گورچیلە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بـەخۆی‌و ئـەو تاکانەی کە میزیان نیە.

ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدراوە بـە شـێوەی بـەکارهێنان‌و بـەپێی ویسـتی پزیشـك جیاوازە.

- زیانـە لاوەکییـەکان: کـەمبوونی باڵەپەسـتۆی خـوێن، کـەمبوونی ژمـارەی خڕۆکەکانی سپی‌و پلاکتەکان، کـەمبوونی کالسـیۆم‌و مەگنیسـیوم‌و پۆتاسـیۆم، زیـادبوونی شـەکری خـوێن، زەردوویـی - تاری بینین، سەرسووڕان ـ سکچوون.



gabapentin گاباپێنتین

- ناوی بازرگانی: Neurontin
- گرووپی دەرمانی: پەرکەم.
- شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ۱۰۰و ۳۰۰ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕی: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ کۆنترۆڵی گرژی شەوی یەکەم ۳۰۰ ملگمو لە ڕۆژی دووەم هەر ۱۲ کاتژمێر یەك دانەو پاشان هەر ۸ کاتژمێر یەك دانەو بەپێی کاریگەری دەرمان تا ۳،٦گم دەکرێ زیاد بکرێت.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەکارهێنانی دەرمان لە کاتی بەیانی.
- بۆ بەرگرتن لە هەستیاری بە ڕۆناکی لە جلو بەرگی گونجاو دژی خۆر سوود وەربگرن.
- ئەگەر ڕێژەی پۆتاسیۆم کەم بێت دەبێ لە پارێزکردنێك بە پۆتاسیۆمی بەرز سوود وەربگیرێ.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توندی دەرمانەکە.

● زیانە لاوەکییەکان: خەوالّوویی، سەرئێشە، نەبوونی هاوسەنگی، لەرزین، خەمۆکی، زیادکردنی کێش، زیادبوونی ئارەزووی خواردن، کۆکە، ترپەی دڵ، هاتنە خوارەوەی ئاو لە لووت.

فێرکردنی نەخۆش:

- لانی کەم بە ٢ کاتژمێر لە ئەنتی ئەسیدەکان بەکاربهێنرێت.

- دەکرێ کەپسوولەکان بکرێنەوەو لە ئاوی میوەدا بتوێنرێنەوە.

- نابێ بە شێوەیەکی لە ناکاو بەکارهێنانی دەرمانەکە ڕابگیرێ.

## جم فیبرۆزیل GEMFIBROZIL

● ناوی بازرگانی: Lopid

*گرووپی دەرمانی: دژی چەوری خوێن، فیبرات.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٣٠٠ ملگمو حەبەکانی ٤٥٠ ملگم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

*بەکارهێنانی لە شیردان: بێ زیانی ئەم دەرمانە نەسەلمێنراوە.

*بەکارهێنان: لە زیادبوونی تری گلیسریدەکانو زیادبوونی زۆری کۆلسترۆل.

ڕێژەی بەکارهێنان: تا ١٢٠٠ ملگم دەکرێ ڕۆژانە بەکاربهێنرێت.

*بەکارنەهێنان: ناهاوسەنگی توندی گورچیلەو جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: کەمبوونی ژمارەی خڕۆکەکانی سپی، هێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، ژانە سک، سەرئێشە، سەرسووڕان، ژانی ئەندامەکان، کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکان، خوران، زەردوویی، ئاوسانی قوڕگ.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشک لەو کاتانەی خوارەوە: سکچوون، هێڵنج، ڕشانەوە، لەرزین، تا، قوڕگ ئێشە، ئاوسانی سک.

## جنتامایسین gentamicin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك.

● شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ٢٠-٤٠و ٨٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی ڕێڕەوی میزو لەگەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٣ تا ٥ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش ڕۆژانە، دوزی ئاسایی ئەم دەرمانە ٨٠ ملگم هەر ٨ کاتژمێر بۆ بەتەمەنەکانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: کەڕیو کەمبوونی بیستن، لاوازی گشتی، خوران، برینی دەم.

پارێزگاریەکان: ناهاوسەنگی کارکردنی گورچیلە، کەمبوونی بیستن، پارکینسون، سکچوونو کەمبوونی ئاوی سك، تاکەکانی بە تەمەنو ساوایان.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەماوەی بەکارهێنانی دەرمان شلەمەنی زۆر بەکاربهێنرێت.

- ئاگادارکردنی پزیشك لەم کاتانەی خوارەوە: کەمبوونی بیستن، هەست کردن بە پری لەسەر دەنگی جەرەسو گرمە لەگوێ.

## گلی بنکلامید glibenclamide

● ناوی بازرگانی: Glyburide

● گرووپی دەرمانی: دژی نەخۆشی شەکرە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی ئەم دەرمانە لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵبسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: دابەزینەری شەکری خوێن.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە سەرەتادا بە نیو حەب تا یەك حەب دەست پێ بکرێتو بە مەودای یەك هەفتە نیوی حەبی تر بەم دوزە زیاد دەکرێت، لانی زۆری ژەمی ڕۆژانە ٤ حەبە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، هەوکردنی توند، بارودۆخی کتواسیدوز دیابتی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە - سەرسووڕان - بێ خەوی - پەشێوی - خەمۆکی - کەمبوونی ژمارەی خڕۆکەکانی سپی - ژانی ئیپیگاستر.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی فەرامۆش کردنی دوزی دەرمان دەست بەجێ پاش بەبیرهاتنەوە بەکاری بهێنن.

– لەکاتی دابەزینی شەکری خوێن پەرداغێك شەربەت بخۆنەوە.

## گرانی ستڕون granisetron

● ناوی بازرگانی: Kytril

● گرووپی دەرمانی: دژی هێڵنجو دژی ڕشانەوە.

● شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ٣ ملگمو حەبەکانی ١ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: توێژینەوەی لەسەر نەکراوە.

*بەکارهێنان: ڕشانەوەکانی توند بەدیهاتوو لە چارەسەری کیمیایی، هێڵنجو ڕشانەوە پاش نەشتەرگەری.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ میکروگرام بۆ هەر کیلوگرام کێشی لەش بە شێوەی ماسوولکەیی دەرزی لێبدرێت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، بێ خەوی، پەشێوی، بەرزبوونەوە یان دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ژانە سك، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، سکچوون،

ئاوسانی سک، هێڵنج، کەمبوونی خانەکانی خوێن، هەڵوەرینی قژ، کۆکە.

فێرکردنی نەخۆش:

١ـ لەوانەیە لەکاتی بەکارهێنان یا پاش ئەو نەخۆش تووشی تا بێت.

– چارەسەرکردنی ژانەسەر بە ژان لابەری سووک.

– ئاگادارکردنی پزیشک لە: سکچوون ـ قەبزی.

## گایافنزین guaifenesin

● ناوی بازرگانی: Amonidrin

● گرووپی دەرمانی: خڵت هێنەر.

● شێوەی دەرمانی: شەربەتەکانی ١٠٠ ملگم لە هەر ٥ سی سی.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: مەترسیدار نەبوونی دەرمان نەسەلمێندراوە.

*بەکارهێنان: کۆکەکانی خڵت هێنەر، کاڵ کەرەوو، دەرهێنەری خڵت، برونشیت.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ٢٠ سی سی هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، خەواڵوویی، سەرسووڕان، سەرئێشە.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل.

– سەردان کردنی پزیشک ئەگەر زیاتر لە ٧ ڕۆژ کۆکەکە درێژەی هەبوو.

– باشترە هاوڕێ لەگەڵ شەربەت بڕێکی ئاو بەکاربهێنن.



HALOPERIDOL هالۆپریدۆل

- ناوی بازرگانی: Haldol
- گرووپـــی دەرمـــانی: دژی ســـایکوز (ناهاوسەنگی توندی دەروونی).

شێوەی دەرمانی: حەبـەکانی ٠.٥، ٢و ٥ ملگمو ئەمپوولەکانی ٥ ملگم.

- بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـــەکارهێنان: ناهاوســـەنگی تونـــدی ڕەوانی، پەشێوی توند، چارەسـەری لـە کیمیـا دەرمـانی شـێرپەنجە، شـێتی، شیزۆفرینیا.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لـە ناهاوسـەنگییەکانی تونـدی دەروونـی: ٠.٥ تا ٢ ملگم ڕۆژانە خۆراکی ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژ.

لە پەشێویەکان: ١ تا ٢ ملگم دەماری هەر ٢ تا ٤ کاتژمێر.

*بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری تونـــد، زیانەکانی دەماغ.

- زیانــە لاوەکییــەکان: وشــکی مــلو لاریـــوونی مـــلو دەم، خـــەواڵوویی، سەرئێشـــــە، سەرســـووڕان، گـــرژی، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، وزەوزی گوێ، تاری بینین، میزگیران.
- فێرکردنی نەخۆش:

- لـە تاکـەکانی بـە ساڵاداچـووندا دوزی دەرمانەکە کەم بکرێت.

- تـا ٣٠ خولـەك پـاش دەرزی لێـدان بەشێوەی ماسوولکەیی دەبێ نـەخۆش خۆی درێژ بکات.

- خۆپاراستن لە هەڵکەوتن لەبەر خۆر.

٤ـ لە کـاتی بـەکارهێنانی درێژخایـەن لـە ڕاگیرانــی لــە ناکــاوی دەرمــان خۆتــان بپارێزن.

## هێماتینیك hematinic

- ناوی بازرگانی: Autrin
- گرووپی دەرمانی: ڤیتامین.
- شێوەی دەرمانی: کەپسوولی هەڵگری ڤیتامین b12 فروس سۆلفات، ڤیتامین Cو فولیك ئەسید.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی a.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕێپێدراوە.

*بەکارهێنان: چارەسەری ئانمییەکانی بیّ زیان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە یەك کەپسوول.

*بەکارنەهێنان: کۆبوونەوەی ئاسن لە لەشدا.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج سووتانەوەی سەرەوەی دڵو ڕشانەوە.

فێرکردنی نەخۆش:

-لەگەڵ خواردن، یا پاش خواردن بەکاربهێنرێت.

## هیپارین heparin

- ناوی بازرگانی: Liquaemin
- گرووپی دەرمانی: دژی مەین.
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولەکانی ٥٠٠٠و١٠٠٠ یەکە.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: پێشگرتنو چارەسەری خوێن مەینی قووڵی خوێن هێنەرەکان. چارەسەری لە پڕ وەستانی دڵو لە پڕ وەستانی دەماغ بێجگە لە خوێن بەربوونی دەماغ.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك.

*بەکارنەهێنان: خوێن بەربوونی ئەکتیڤ. ناتەواوی گەدە، هەستیاری بەخۆی. سکپڕی، شیرخۆر، کەم خوێنی لەگەڵ کلافۆران لازیکس.

● زیانە لاوەکییەکان: خوێن بەربوون، کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکان، تاو خوران.

فێرکردنی نەخۆش:

- سەردان کردنی پزیشک لەکاتی خوێن بەربوون لە پوو، یا خوێن بەربوون لە هەر شوێنێکی لەش.

- لەناوبەری کاریگەری ئەم دەرمانە پرۆتامین سۆلفات.

## HYDRALAZINE هیدرالازین

● ناوی بازرگانی: Apresoline

● گرووپی دەرمانی: والآکەرەوەی دەرمانەکان، دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠، ٢٥و ٥٠ملگمو ئەمپوولەکانی ٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC .

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی ناوەند تا توند بە تایبەت لە سکپڕیدا، نارێکی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان:

بۆ چارەسەری پاڵەپەستۆی خوێن: سەرەتا ١٠ ملگم ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٢ تا ٤ هەفتەو پاشان تا ٢٥ ملگم ٤ جار لەرۆژ.

لە نارێکی دڵدا: بە ٥٠ تا ٧٥ ملگم دەست پێ دەکرێت، پاشان بەپێی ویست زیاد دەکرێ تا ٦٠٠ ملگم.

*بەکارنەهێنان: هەبوونی نەخۆشی لە دەمارەکانی خۆراك، دەری دڵ، نەخۆشی رۆماتیزمی دەرچەی میترال.

● زیانە لاوەکییەکان: دابەزینی پاڵەپەستۆی دڵ، لێدانی دڵ، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، ئاوسان، سەرێشە، خەمۆکی، هێڵنج، پەشێوی، قەبزی، کەمبوونی ژمارەی خڕۆکە سپییەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

– ئاگادارکردنی پزیشك لە: ژانی سنگ، شەکەتی زۆر، تا، ژانی ماسوولکە.

**هیدرۆکلرۆتیازید**

**HYDROCHLOROTHIAZIDE**

● ناوی بازرگانی: Esidrex

● گرووپــی دەرمــانی: میزهێنــەر – دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠ ملگم.

● بـەکارهێنان لـە سـکپڕیدا: گرووپـی B (بەڵام لـەو سـکپڕییەی کـە بووبێتـە هـۆی بەرزبوونـەوەی پاڵەپەسـتۆی خـوێن بـە گرووپی D دەژمێردرێت.

بەکارهێنان لە شیردان: بـێ زیان بـوونی نەسەلمێنراوە.

*بەکارهێنان: پاڵەپەسـتۆی خـوێن، کـەم کـەرەوەی لابردنـی کالسـیۆم لـە میـزداو بەرگرتن لە دروست بوونی بەردی زۆر.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ١\٤ تـا یـەك حـەب خۆراکیو گرێدراو بە ڕێژەی وڵامدانەوە تا ٢ حـەب دەکـرێ بـدرێ، بـەڵام بـەکردەوە دوزەکـانی زیـاتر لـە ٢٥ ملگـم سـوودێکی زیاتر پێشان نادات.

*بەکارنەهێنان: نەبوونی میز.

● زیانە لاوەکییەکان: کەمبوونی ژمارەی خانــەکانی خــوێن، زیــادبوونی شــەکری خوێن، کـەمبوونی پۆتاسـیۆم، زیـادبوونی کالســیۆمو ئــوریێ، نــاڕێکی گورچــیلە کــەمبوونی ئــارەزووی خــواردن، لــێ وەرینی قژ.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمانەکـــــە لـــــە بەیانیـــــەکان بەکاربهێنرێت.

– لـە مـاوەی بـەکارهێنانی دەرمـان لـە خواردەمەنیـەکانی هــەڵگری پۆتاسـیۆم سوود وەربگیرێ.

– ئاگـــادارکردنی پزیشـــك لـــە: هێڵـــنج، ڕشانەوەی توند، لاوازی گشتی، گرژی.

هیدرۆکۆرتیزۆن
HYDROCORTISONE

● ناوی بازرگانی: Cortef
● گرووپی دەرمانی: کورتوون، دژی هەوکردن، دژی هەستیاری.
● شێوەی دەرمانی: ئەمپوول‌و کرێم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی توند، نەخۆشیەکانی چاو، خوران، ئەکزیما، هەوکردنی پێست، سووربوونەوە، تلیشان، خورانی کۆم، هەوکردنی چاو، کەمی ئەدرینالین، نارێکی سییەکان، هەستارییەکان، تەنگەنەفەسی.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك دوزی دەرمان جیاوازە.

*بەکارنەهێنان: شیرخۆر، تووش بوون بەنەخۆشیەکانی کەڕوو، برین‌و ناتەواوی گەدەو دوازدە گرێ، بەرزی پاڵەپەستۆی خوێن، گرێ، قۆلۆن، کەمی ڕژێنی دەرەقی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، تووڕەبوون، بێ خەوی، نارێکی دڵ، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، زیپکە، برینی گەدە، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی ناوەوەی چاو، زیادکردنی کێش، پووکانەوەی ئێسك.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی بەکارهێنانی درێژخایەن نابێ لەناکاو بەکارهێنانەکەی ڕابگیرێ.

– نابێ بە شێوەی ژێر پێست دەرزی لێ بدرێت.

هیدرۆکینۆن hydroquinone

● ناوی بازرگانی: Eldogin
● گرووپی دەرمانی: مەهارکەری سنتزملاتین، بێ ڕەنگ کەڕوو دژی پەڵە.
● شێوەی دەرمانی: کرێم ٢و ٤ لەسەدا.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری پەڵەو بۆیەی ڕوخسارو دەمامکی بەجێ ماو لە سکپڕی.
ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢ جار بەیانی‌و شەو.
*بەکارنەهێنان: منداڵانی تەمەن لە خوارەوەی ١٢ ساڵ چوونە بەر تیشکی خۆر.
● زیانە لاوەکییەکان: سووتانەوەو سووربوونی شوێنی کرێم لێدراو.
فێرکردنی نەخۆش:
– نابێ لە چاو بدرێ.
– لەکاتی چوونە بەرتیشکی خۆر لە کرێمی دژە خۆر وەربگیرێ.
– لەکاتی چاك نەبوونەوە پاش ٢ مانگ دەرمانەکە بەکارنەهێنرێت‌و پزیشك ئاگاداربکرێت.

## هیدرۆکسی کلرۆکین hydoxychloroquin

● ناوی بازرگانی: Plaquenil
● گرووپی دەرمانی: دژی مالاریاو دژی رۆماتیزم.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٠٠ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.
*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری‌و پێشگرتن لە جۆرەکانی مالاریا ئارتریت روماتوئید لوپوس.
ڕێژەی بەکارهێنان: لە ئارتریت روماتوئید: ٤٠٠ تا ٦٠٠ ملگم.
لە پێشگرتن لە مەلاریا: بەپێی ویستی پزیشك.
*بەکارنەهێنان: پسوریازیس، نارێکی جگەر، کەمبوونی g6pd .

● زیانە لاوەکییەکان: ناهاوسەنگی بینین، گۆڕانکاریەکانی هەڵس و کەوت و بێ ئۆقرەیی، سەرئێشەو سەرسووڕان.

فێرکردنی نەخۆش:

– بە شێوەی گەری دەبێ پشکنینی چاو ئەنجام بدرێت.

– لەوانەیە ڕەنگی میز بۆ قاوەیی بگۆڕدرێت.

– ئاگادارکردنەوەی پزیشک لەکاتی: کێشەکانی بیستن و بینین، تا، شەکەتی، ڕەش هەڵگەڕان و خوێن بەربوون.

– دەرمانەکە لەگەڵ خواردن بەکاببهێنرێت.

– جگەرو خوێن دەبێ لە ماوەی چارەسەریدا چك بکرێت.

**هیدرۆکسی زین hydroxyzine**

● ناوی بازرگانی: Atarax

● گرووپی دەرمانی: هێمنکەرەوە. دژی ڕشانەوەو دژی خوران.

● شێوەی دەرمانی: شەربەت، حەبەکانی ١٠و ٢٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: خوران، پەشێوی، لیر، کۆنترۆڵ کردنی ڕشانەوەو زیادکردنی هەستیاری.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: تەنگەنەفەسی ساوایان، هەستیاری زیاد، نەخۆشەکانی خەمۆکی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، گرژی، خەواڵوویی، پەشێوی، تربون، قەبزی، هێڵنج، وشکی دەم، میزگیران، پەرچەکرداری زیادبوونی هەستیاری.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستی بە وشیاری هەیە.

– خۆپاستن لە دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

– بۆ نەهێشتنی وشکی دەم دەکرێ لە بنیشت نەبات یان خواردنەوەی ئاو سوود وەربگیرێ.

– دەرمان لە سەرەتادا خەواڵوویی زۆر بەدی دێنێ، بەڵام هێواش هێواش لە توندییەکەی کەم دەبێت.

**هیوسین** **Hyoscine**

● ناوی بازرگانی: Buscopan

● گرووپی دەرمانی: دژی ئسپاسمی هەرسکردن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ ملگم، ئەمپوولەکانی ٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: سکچوون، ئێشەکانی ئسپاسمی دژی ڕشانەوەو سووری مانگانەی دەردناک.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ حەب ٤ جار لە ڕۆژ لەسووڕی مانگانەی دەردناك: دەبێ دەرمانەکە ٢ ڕۆژ بەر لە دەستپێکی سووڕی مانگانە بەکاربهێنرێت.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی گیرانی کۆئەندامی هەرس، تەنگەنەفەسی. نەخۆشی درێژخایەنی سییەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: وشکی دەم. میزگیران، قەبزی، زیادبوونی ترپەکانی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

– لە ژانە سکەکانی بەردەوام، بێ ئاگاداری پزیشك بەکارنەهێنرێت.

– لە سکچوونی خوێنیو هەوکردندا نابێ لەگەڵ ئەنتی بایوتیك بەکاربهێنرێت.



ibuprofen ئیبوپرۆفن

● ناوی بازرگانی: Advil

● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن، دژی ئێش.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۲۰۰و ٤۰۰ ملگمو شەربەت ۱۰۰ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b. (لە سێ مانگی سێیەمی سکپڕیدا گرووپی d).

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی زۆر بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی جومگە، جومگەژان، سووڕی مانگانەی دەردناک.

ڕێژەی بەکارهێنان:

بۆ کەمکردنی هەوکردنی جومگە: ۳۰۰ تا ۸۰۰ ملگم ۳ تا ٤ جار لە ڕۆژدا (لانی زۆر ۸ حەب).

بۆ دوزەکانی ئاسایی یەك تا ۲ حەب هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

*بەکارنەهێنان: برینی گەدەی ئەکتیف، پەرچەکرداری زۆری هەستیاری، نەخۆشی جگەرو گورچیلەی توند.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرس، زیانەکانی گوێ، تاری بینین، هەبوونی خوێن لە میزدا.

فێرکردنی نەخۆش:

- حاڵەتەکانی خوارەوە هێمای ژارانگەزی دەرمانی یەو دەبێ پزیشك ئاگادار بکرێت: تاری بینین، دەنگی گرمەو زەنگ لەگوێ.

- خۆپاراستن لە ئەنجامدانی کارەکانی مەترسیدارو لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل، چونکە ئەم دەرمانە لەوانەیە بەدیهێنەری سەرسووڕان بێت.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ٦٥٠ ملگم ڕۆژانە ٣ جار بۆ ماوەی ٢٠ ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: کێشەکانی گورچیلەو جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: لاوازی، هێڵنج، سەرئێشە، فەرامۆشی، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، ژانە سك، گۆڕینی ڕەنگی قژ و نینۆك، ژانی ماسوولکە، تاو لەرز، خورانی کۆم، هەڵوەرینی موو.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئەم دەرمانە دژی سکچوون نیە (بە پێچەوانەی وێناکردنی زۆربەی خەڵك).

- ئاگادارکردنی پزیشك لە کاتی سەرهەڵدانی زیانە لاوەکییەکان.

- دەرمان پاش خواردن بەکاربهێنرێت.

## ئیزونیازید isoniazid

● ناوی بازرگانی: Laniazid

● گرووپی دەرمانی: دژی سیل.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠٠و ٣٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری سیلی سییەکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش ڕۆژانە یەك ژەم بۆ ماوەی ٩ مانگ تا ٢ ساڵ لانی زۆر ڕۆژانە ٣٠٠ ملگم.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشیەکانی گورچیلەو جگەر، منداڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: تەزینی ئەندامەکان، تا، هێڵنج، ڕشانەوە، وشکی دەم، بەرزبوونەوەی شەکری خوێن، هەوکردنی دەماری بینایی.

فێرکردنی نەخۆش:

- هـیچ کاتێـك بـەکارهێنانی دەرمـان دووبەرابەر یاخود لانەبرێت.
- پشـکنینی چـاو و کـۆنترۆڵ کردنـی پاڵەپەستۆی خوێن ئەنجام بدرێت.
- باشتر وایە دەرمان یەك کاتژمێر بەر لـە خـواردن یـان ٢ کاتـژمێر پـاش خـواردن بەکاربهێنرێت.
- بەکارهێنانی هاوکاتی ڤیتامین b6 .

ئیزۆسۆربايد دینیترات

isosorbid dinitrate

● ناوی بازرگانی: Isordil

● گرووپـی دەرمـانی: دژی ژانـی دڵ- نیترات.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ ملگم، حەبەکانی ٤٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

● بـەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی دەرمـان لـە بەرامبـەر زیانـەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری ئانژینی دڵ، پێشـگرتن لـە ژانـەکانی دڵ، ئسـپاسمی سورێنچك.

رێـژەی بـەکارهێنان: ٢٠ تـا ٤٠ ملگـم خۆراکی هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

*بەکارنـەهێنان: دابـەزینی پاڵەپەسـتۆی خـوێن، کـەم خـوێنی تونـد، زیـادبوونی پاڵەپەسـتۆی قاپێلکـەی سـەر، خـوێن بەربوونی دەماغ، لەپڕ وەستانی دڵ.

● زیانـە لاوەکییـەکان: سەرسـووڕان، ترپەی دڵ، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، نارێکی دڵ، هێڵنج، ڕشـانەوە، شـەکەتی، گرگرتن.

فێرکردنی نەخۆش:

- بە هێواشی بارودۆخەکـەتان بگـۆڕن تـا لـە پەیـدابوونی دابـەزینی پاڵەپەسـتۆ ڕێگری بکرێت.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.
- لەوانەیـە دەرمانەکـە ببێتـە هـۆی سەرئێشـە، وە بـەکارهێنانی دەرمـان

له پێگەیشتووان: ١ تا ٢ حەب لە ڕۆژدا.

منداڵانی تەمەن لە سەرەوەی ٣ ساڵ: ٥ سی سی شەربەت ٢ جار لە ڕۆژ لەگەڵ خواردەمەنی.

ساوایانی ٦ مانگ تا ٣ ساڵ: ٢.٥ سی سی شەربەت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆیو پەلەمارەکانی توندی تەنگەنەفەسی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، شەکەتی، هێڵنج، ڕشانەوە، دابەزینی کێش، لیر، وشکی دەم.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول، ئەسپرینو دیکلوفناکو ئیبۆپرۆفنو .....

- ئاگادارکردنی پزیشک لە کاتی: تاری بینینو وزەوزی گوێ.



lactulose لاکتولۆز

● ناوی بازرگانی: Cephulac

● گرووپی دەرمانی: نەرم کەرەوە.

● شێوەی دەرمانی: شەربەت.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: قەبزی، زەردکی مۆخ، پەك کەوتنی جگەرو بەرەو لەناوچوونی.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە قەبزی درێژخایەن: ١٥ تا ٣٠ سی سی ڕۆژانە خۆراکیو زیادکردنی تا ٦٠ سی سی.

لە کۆمای جگەردا: هەریەك کاتژمێر ٣٠ سی سی.

بەکارنەهێنان: گیرانی ڕیخۆڵە.

● زیانە لاوەکییەکان: سکچوون، ژانە سک، ئاوسانی سک، هێڵنج.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەستپێکی کاریگەری دەرمان ٢٤ تا ٤٨ کاتژمێرە.

– دەرمان بە پەرداغێك ئاو یان شیر بەکاربهێنرێت تا ڕێژەی هەڵمژینی زیاد بێت.

– بەکارهێنانی شلەمەنیەکان تا ٢ لیتر لە ڕۆژدا زیاد بکرێت.

– نابێ بۆ ماوەیەکی درێژخایەن سوودی لێ وەربگیرێ.

**لامی ودین** lamivudine

● ناوی بازرگانی: Epivir

● گرووپی دەرمانی: دژی ڤایرۆس.

● شێوەی دەرمانی: حەبی ١٠٠و ١٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: شیردان دەبێ ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری هەوکردنی ڤایرۆسی دژی هیپاتیتو ئایدز.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە هیپاتیتی b: ١٠٠ ملگم ڕۆژانە یەك جار.

لە ئایدز: بەپێی کێشی نەخۆش جیاوازی هەیە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توندو هەوکردنو نارێکی پانکراس.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، شەکەتی، کێشەکانی خەو، هەوکردنو نارێکی پانکراس، کەم خوێنی، کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکانو خڕۆکەی سپی، ژانەکانی ماسوولکەیی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی خوێنبۆ ئەرزیابی کەم خوێنی.

– دەرمان دەبێ لەسەر بڕیاری پزیشك ڕابگیرێ.

– ئەو کاتەی کە نەخۆش لەژێر چارەسەرکردن بەدەرمانەیە هێشتا بە هەوکردن دەژمێردرێت، بۆیە دەتوانێت

## لووتیرۆکسین levothyroxin

● ناوی بازرگانی: Eltroxin
● گرووپی دەرمانی: هۆرمۆنی تیروئید.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٠.١ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی a.
● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.
بەکارهێنان: چارەسەری کەم کاری تیروئید.
● ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدراوە بە ویستی پزیشك بە یەك حەب یان نیوەی حەب دەست پێ دەکرێتو لەگەڵ ئاوریدانەوە لە تاقیکردنەوەکانی نەخۆش ژەمی نەخۆش ڕیك بخرێت.
*بەکارنەهێنان: پرکاری ئیروئید، وەستانی دڵ.
● زیانە لاوەکییەکان: ترپەی دڵ، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، وەستانی دڵ، ژانی دڵ، سکچوون ـ بەرگە نەگرتنی گەرما ـ ناڕێکی لە سووڕی مانگانەی ئافرەتان ـ لەرزینی دەست.
فێرکردنی نەخۆش:
– ئاگادارکردنی پزیشك لە: شلەژاوی ـ پەشێوی کە هێمان بۆ زیادکردنی ژەمی دەرمان.
– شتەکانی تیروئید دەبێ ٦ تا ٨ دەست پێ بکات یان گۆڕانکاری ژەمی دەرمان ئەرزیایی بکرێت.
– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی خواردەمەنییەکانی هەڵگری یۆد وەکو خوێی یۆد دار، سویا، جۆرەکانی نان. خواردەمەنیەکانی دەریایی کە پڕبن لە یۆد.
– ئەو تاکانەی کە کەم کاری تیروئیدیان هەیە دەبێ تا کۆتایی تەمەن ئەم دەرمانە بەکاربهێنن.

**لیدوکائین هیدروکلراید lidocaine hcl**

- نـــــــــــاوی بازرگـــــــــــانی: Xylocaine
- گرووپـی دەرمـانی: بـێ هەسـت کـەری شوێن.
- شێوەی دەرمانی: لێـدانی - مەرهـەم - سپرا.
- بەکارهێنان لە سکپڕی: گرووپی b.
- بـەکارهێنان لـە شـیردان: بـە وریـایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: بێ هەستی لە چارەسـەری ئاریتمەکانی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك جیاوازە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند بەخۆی.

- زیانــە لاوەکییــەکان: لــەکاتی دەرزی لێـدان بــە شـێوەی دەمـاری زیانــەکانی لاوەکییـــــەکان وەکــــو سەرئێشـــــە، سەرسـووڕان، گێـژی، خـەوالّوویی، تـاری بیـنین، هێڵـنج، دابــەزینی پاڵەپەسـتۆی خوێن وەستانی دڵ، تەنگە نەفەسی - لـێر - سەرهەڵدەدەن.

فێرکردنی نەخۆش:

– نابێ دەرمانەکە لە چاو بدرێت.

– ئەگـــەر لـــەناو دەم ســـوودی لـــێ وەردەگیرێ تا ئەو کاتەی کە بـێ هەسـتی لە ئارادایـە دەبـێ لـە جـوینو خواردنـەوە خۆتان بپارێزن.

**لیندان lindane**

- ناوی بازرگانی Kwell
- گرووپـــی دەرمـــانی: دژی نەخۆشـــی گروویەتی - دژی ئەسپێ.
- شێوەی دەرمانی: شامپۆ- لوسیون.
- بــــەکارهێنان لــــــە ســـــکپڕیدا: ڕاناسپێردرێت.

*بـەکارهێنان: بۆچارەسـەری ئەسـپێ - گروویەتی.

ڕێژەی بەکارهێنان:

بۆچارەسـەری ئەسـپێی سـەر: لەشـوێنی تووشبوو بماڵدرێت، شـامپۆ بـۆ مـاوەی ٥ خولەك لەسەر قژ بمێنێو پاشـان بشـۆنو

● زیانـە لاوەکییـەکان: قـەبزی، هێڵـنج، ڕشـــانەوە، وشـــکی دەم، لاوازیو سەرسووڕان ـ لیر ـ ژانە سك، خەواڵوویی.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل لـە کاتی بەکارهێنانی دەرمان.

– بـــەکارهێنانی شـــلەمەنی لەلایـــەن نەخۆشەوە.

– ئاگادارکردنی پزیشك لە هەر چەشنە تا یان نەوەستانی سکچوون.

**لۆراتادین** loratadine

● ناوی بازرگانی: Claritin

● گرووپی دەرمانی: دژی هەستیاری.

*شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـــەکارهێنان: چارەســـەری لـــیری درێژخایەن، هاتنە خوارەوەی ئاو لە لووت (ئالرژیکی وەرزی).

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ڕۆژانـە یـەك حـەب بەساڵاچووان.

*بەکارنـــەهێنان: نەخۆشـــی جگـــەرو گورچیلە.

● زیانە لاوەکییەکان: لاوازی، سەرئێشە. وشـکی دەم، بـێ خـەوی، شـەکەتی. تووڕەبوون.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

**لورازپام** lorazepam

● ناوی بازرگانی: Atiran

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی گـــرژی. خەوهێنەر.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١و ٢ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕناسپێردرێت.

*بـەکارهێنان: بـێ خـەوی، پەشـێوی. گوشاری روحی، گرژی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٦ ملگم ڕۆژانە لە ژەمـــەکانی دابەشـــکراو گرێدراوبـــە نەخۆشیو بەپێی ویستی پزیشك.

*بەکارنەهێنان: ژارانگەزی بە ئەلکهول، کۆما. منداڵانی کەمتر لە٢ ساڵ، خەمۆکیو ناهاوسەنگی دەروونی توند.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، سەرسووڕان، سەرئێشە، لاوازی، شەکەتی، مۆتەکەی شەوانە، هێڵنجو ڕشانەوە، وشکی دەم، میزگیران، دابەزین یا بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەگەر پەشێوی، شڵەژاویو بێ خەویو ئسپاسم بەدی بێت، دەبێ بەکارهێنانی دەرمانەکە ڕابگیرێ.

– بەکارهێنانی دەرمان لەگەڵ خواردەمەنی یان شیر.

– بێ دەستووری پزیشک نابێ زیاتر لە چوار مانگ بەکاربهێنرێت.

– خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێلو خواردنەوەی ئەلکهول.

– لە ماوەی چارەسەری درێژخایەن بەکارهێنانی دەرمان نابێ ڕابگیرێ.

**لوزارتان LOSARTAN**

● ناوی بازرگانی: Losar

● گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥و ٥٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت، باشترە شیری دایك ڕابگیرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری پاڵەپەستۆی خوێن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب ڕۆژانە، لانی زۆر ڕێژەی بەکارهێنان ١٥٠ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توندی دەرمانی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، سەرئێشە، سکچوون، بەدهەرسکردن، ژانی ماسوولکە، کۆکە.

فێرکردنی نەخۆش:

– تەنانەت ئەگەر هەست بکەن کە باشترن دەبێ درێژە بە بەکارهێنانی دەرمانەکە بدەن.

– ئاگادارکردنی پزیشك لە سەرهەڵدانی دەم کولی، تا، ئاوسانی دەستو پێ، ترپەکانی نارێکی دڵ.

– بەشێوەی لەناکاو بەکارهێنانی دەرمانەکە ڕانەگرن.

– لە کاتی هاوڕێیی لەگەڵ دەرمانەکانی میزهێنەر کاریگەری دژی پاڵەپەستۆی خوێنی دەرمانەکە زیاد دەبێت.

**لوڤاستاتین lovastatin**

● گرووپی دەرمانی: دابەزێنەری چەوری خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

● بەکارهێنان لە شیردان: نابێ بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری زیادبوونی کۆلسترۆڵی خوێن.

ڕێژەی بەکارهێنانی: ١ تا ٢ حەب ڕۆژانە تا ٨٠ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی ئەکتیڤی جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، بەدهەرسکردن، ناهاوسەنگی لە کارکردنی جگەر، سەرسووڕان، سەرئێشە، هەوکردنی ماسوولکە، ژانی جومگەکانو ماسوولکە، تاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەوانەیە پێویست بە چەند ساڵ چارەسەری هەبێت.

– شتەکانی جگەر دەبێ بەر لە دەسپێكو ٢ مانگ پاش دەسپێك چك بکرێت.

– باشترە شەدەکان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

# M

## هیدرۆکسید مەگنیسیۆم
## magnesium hydroxid

- ناوی بازرگانی:

milkofmagnesia

- گرووپی دەرمانی: ئەنتی ئەسید، نەرمکەرەوە.
- شێوەی دەرمانی: سوسپانسین.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: زیانە لاوەکییەکان نەسەلمێندراون.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری قەبزی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە لە نەخۆشخانە نوێندراون.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە پێگەیشتوواندا: ٣٠ تا ٦٠ سی سی خۆراکی ١ ژەم یان زیاتر.

لە منداڵانی ٢ تا ١٢ساڵ: ٥ تا ٣٠ سی سی ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: نارێکی گورچیلە، ژانی سکی بێ هۆ، گیران یان کون بوونی ڕیخۆڵە، سکچوون.

- زیانە لاوەکییەکان: سکچوون، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

- پەرداغێك ئاو پاش بەکارهێنانی دەرمان بەکاربهێنرێت.

## مدروکسی پروژستڕون
## medroxyprogestron

- ناوی بازرگانی:

Depo _ Provera

- گرووپی دەرمانی: دژی سکپڕی.
- شێوەی دەرمانی: حەبو ئەمپوول.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ ڕێگرتن لە سکپڕی، ڕێگرتن لە پیتانی هێلکە، خوێن بەربوونی منداڵدان، چارەسەری یارمەتیدەر لە شێرپەنجە.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: بـۆ ڕێگـرتن لـە سکپڕیدا یەك ئەمپوول ١٥٠ ملگم هەر سێ مـانگ ١ جـار بـە شـێوەی دەرزی لێـدانی ماسوولکەیی.

*بەکارنـەهێنان: شـێرپەنجەی مـەمك، هـەبوونی خـوێن مـەیین لـە دەمارەکـان - هێڵـنج - زیـادکردنی کـێش، زەردوویـی، خەمۆکی، زیادبوونی شەکری خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئاگـادارکردنی پزیشـك لـە هـەر چەشـنە ژان و ئاوسـانی بەڵـەك کـە هێمایـەك لـە مەیینی خوێن لە دەمارەکان بێت.

- بەکارنەهێنانی جگەرە.

مبندازول MEBENDAZOLE

● ناوی بازرگانی: Vermox

● گرووپی دەرمانی: دژی کرم.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی جوین(کرماندن) ١٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

*بـەکارهێنان:ئالوودگی بـە کرمـەکانی ئەسکاریس - تریشینوزیس.

ڕێـژەی بـەکارهێنانی: پێگەیشـتووان و منـداڵانی گـەورەتر لـە ٢ سـاڵ ١٠٠ ملگـم خۆراکی ڕۆژانە ٢ جـار بـۆ مـاوەی ٣ ڕۆژ و لـەکاتی پێویسـت دا سـێ هەفتـە پـاش دووبارە بکرێتەوە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانـە لاوەکییـەکان: سەرئێشـە، سەرسـووڕان، ژانـە سـك، زیـادکردنی ئانزیمەکانی جگەر، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، هەبوونی خوێن لە میزدا.

*پارێزگاریـەکان: منـداڵانی کـەمتر لـە ٢ ساڵ، ناهاوسـەنگی لـە کـارکردنی جگـەر و نەخۆشی کرون.

*فێرکردنی نەخۆش:

١ــ کـورت کردنـی نینۆکـەکان و شوشـتنی دەستەکان بەباشی پاش چوونە W.C

٢ــ تاکـەکانی ئـالوودە دەبـێ بـە تـەنیا بنون، خۆپاراسـتن لـە تەکانـدنی بـەتانی،

شوشتنی بەتانیەکان بە ئاوی گەرمو گۆڕینیان.

٣ـ گۆڕینی جلو بەرگی ژێرەوە ڕۆژانە.

٤ـ گشت تاکەکانی خێزان دەبێ دەرمان وەربگرن.

٥ـ ڕۆژانە W.C بشۆردرێتو بە مادەی پاك كەرەوە خاوێن بکرێت.

مفنامیك ئەسید mefenamic acid

*ناوی بازرگانی: Ponstan

*گرووپی دەرمانی: دژی ئێش، هەوکردن.

*شێوەی دەرمانی: کەپسوولی ٢٥٠ ملگم.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C (لە سێ مانگی کۆتایدا گرووپی d).

*بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دا هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: ژانەکانی سووكو مام ناوەندی ددان، ژانی سووڕی مانگانە.

*ڕێژەی بەکارهێنان: سەرەتا ٢ کەپسوولو پاشان یەك کەپسوول هەر ٦ کاتژمێر.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی هەوکردنی ڕیخۆڵە، خوێن بەربوونی ئەکتیڤی کۆئەندامی هەرس، تەنگەنەفەسی.

*زیانە لاوەکییەکان: ئازارەکانی کۆئەندامی هەرس، ناهاوسەنگی یەکانی خوێن، لیر، هەبونی خوێن لە میزدا، زیادبوونی هەستیاری.

پارێزگارییەکان: ناهاوسەنگی توندی جگەرو گورچیلە، نەخۆشی دەمارەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

– باشتر وایە هاوڕێ لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

– بەکارنەهێنانی دەرمان لە کاتی سکچوونی توند یا زیانەکانی پێست.

– بەکارهێنانی زیاتر لە یەك هەفتە ڕاناسپێردرێت.

– لە چوار مانگی کۆتایی سکپڕیدا بەکارنەهێنرێت.

– بەکارهێنانی دەرمان بە یەك پەرداغ ئاوو خۆ درێژکردن بۆ ماوەی یەك کاتژمێر.

- ئاگاداری کردنی پزیشك لە پاشەڕۆی ڕەش‌و قیڕاوی.

## ملوکسیکام meloxicam

● ناوی بازرگانی: Mobic

● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی نائستروئیدی. سرەوێنەر.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٧.٥و ١٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C (لە سێ مانگی دووەم‌و سێیەم گرووپی d).

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: ئارتروز، هەوکردنەکانی جومگەیی.

ڕێژەی بەکارهێنان: سەرەتا ٧.٥ ملگم‌و لە کاتی پێویستدا ١٥ ملگم لە ڕۆژدا.

بەکارنەهێنان: نەخۆشی توندی گورچیلەو جگەر، برینی گەدە، خوێن بەربوون، تەنگەنەفەسی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، گڕژی، ناهاوسەنگی لە یادگەدا، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، قەبزی، ژانەکانی سك، تاری بینین، کەمبوونی بیستن، گیرانی شلەمەنیەکان، تەنگە نەفەسی، کەمبوونی شەکری خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

- بە پەرداغێك ئاو بەکاربهێنرێت‌و تا نیو کاتژمێر خۆی درێژ نەکات.

- ئاگادارکردنی پزیشك لە پاشەڕۆی ڕەش‌و قیڕاوی، سەرئێشەی بەردەوام.

## منتول سالیسیلات mentholsalicylate

● گرووپی دەرمانی: دژی ئێش، سالیسیلات.

● شێوەی دەرمانی: مەرحەم.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C (لە سێ مانگی سێیەمی سکپڕیدا گرووپی d).

● بەکارهێنان لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

*بـەکارهێنان: ئارامکردنـەوەی ژانـەکانی شوێنی لە ماسوولکەو ئێسکەپەیکەر.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ڕۆژانـە ٤ جـار لـە شوێنی ژانەکە بماڵدرێت.

*بەکارنـــەهێنان: پەچـــەکردارەکانی هەستیاری.

● زیانـە لاوەکییـەکان: زیانـە هـەوکردن‌و پەرچەکرداری شوێن لەسەر پێست.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە لە سـەرەتا دەبێتـە هـۆی هەست کردن بـە سـەرماو پاشـان هەسـت کردن بە گەرما.

– لەســـــەر شـــــوێنی برینـــــدار، هەوکراونەماڵدرێت.

## MESALAZINE مسالامین OR MESALAMINE

● ناوی بازرگانی: Asacol

● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن.

● شـێوەی دەرمــانی: حەبــەکانی ٥٠٠ ملگم. فتیل وانما.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: کولیتی بریندار.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٣ تـا ٦ حـەب ڕۆژانـە بە پێی ویستی پزیشك.

*بەکارنەهێنان: هەسـتیاری یـەکجار زۆر - ناهاوسەنگی لە کارکردنی گورچیلە.

زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، ژانە سـك، سەرسـووڕان، سەرئێشـە، تـەزینی ئەندامەکان، کەمبوونی ژمارەی خانەکانی خوێن، تاری بینـین، وزەوزی گـوێ، ژانـی جومگـەو ماسـوولکە، هـەبوونی خـوێن لـە میزدا.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـــادارکردنی پزیشـــك لـــەکاتی سەرهەڵدانی خـوێن بـەربوونی کۆئەنـدامی هەرس.

– لایەنی کەم فتیلەکە ٣ کاتـژمێر لـە نـاو کۆم دا بمێنێتەوە.

## متفورمین metformin

● ناوی بازرگانی
Glucophage

● گرووپی دەرمانی: ژدی دیابت (نەخۆشی شەکرە).

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ٥٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: لەو کاتانەی کە پێویستە بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بـەکارهێنان: کـۆنترۆڵ کردنـی شـەکری خوێنلە تاکەکانی تووشبووو بـە نەخۆشـی شـەکرە، چارەسـەری جگـەری چـەور، چارەسەری یارمەتیدەری هێلکەدانی پلـی کیستیك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ تا ٤ حەب ڕۆژانە.

*بەکارنـەهێنان: نەخۆشـی درێژخایـەنی جگـەر، نـارێکی دڵ، وەسـتانی دڵ، کـەمبوونی ئۆکسـجین گەیانـدن، ناهاوسەنگی لە کارکردنی گورچیلە.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، کـەمبوونی ئـارەزووی خـواردن، کـەم خوێنی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگـاداركردنی پزیشـك لـەكاتی سـەرهەڵدانی هەناسـەکانی تونـد، گێـژی، هەست بـە ناخۆشـی، لـەرزو شـەکەتی لـە ڕادە بـەدەرو بـەکارهێنانی دەرمانەکـە ڕابگیرێ.

– نـابێ دەرمانەکـە لـەناكاو بەکارنەهێنرێتو لە کاتی دیاریکراو لە ڕۆژ سوودی لێ وەربگیرێ.

## متادون METHADONE

*ناوی بازرگانی: Dolophine

● گرووپی دەرمانی: دژی ژان، سڕکەر.

● شێوەی دەرمـانی: حەبەکانی ٥ ، ٢٠و ٤٠ ملگـم. ئەمپوولـەکانی ٥و ١٠ ملگـم، شەربەت.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: ژانەکانی توندو سندرومی بێ بەشبوون لە سرکەرەکان.

ڕێژەی بەکارهێنان: وەکو دژی ژان ٢.٥ تا ١٠ ملگم خۆراکی ڕۆژانە لە سندرم (دیاردەی) بێ بەشی لە سرکەرەکان بەپێی ویستی پزیشك ٢٠ تا ١٢٠ ملگمز

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر - وەکو دژی ژان لەمندالّبوون.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، خوران، وشکی دەم، قەبزی، ئاوسانی لەش، خەوالّوویی.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی بەکارهێنانی لە ڕاددەبەدەری دەرمان لەوانەیە مودمین بوون بە دیّ بێت.

– هێماکانی ڕاگیرانی بەکارهێنانی دەرمان بریتین لە هێلّنج، ڕشانەوە، ژانەکانی سك، بوورانەوە، کەمبوونی ئارەزووی خواردن.

**متی مازول METHIMAZOLE**

● ناوی بازرگانی: Tapazole

● گرووپی دەرمانی: دژی پڕکاری تیروئید.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥ ملگم.

بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

*بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

بەکارهێنان: بۆ چارەسەری پڕکاری تیروئید.

ڕێژەی بەکارهێنان: بۆ دەستپێکی چارەسەری ٣ تا ١٠ حەب ڕۆژانە. ٢ تا ٣ جار لە ڕۆژ سوودی لێ وەردەگیرێو وەکو چارەسەری ڕاگر ١ تا ٣ حەب ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێلّنج، زەردوویی، ژانی ئیپیگاستر - خوران - زیانەکانی پێست، کەمبوونی خڕۆکە سپییەکان لە خوێن دا.

پارێزگارییەکان: هەوکردن، ناهاوسەنگی جگەر،نەخۆشانی گەورەتر لە ٤٠ سالّ.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لە کاتی هەبوونی تا لەگەڵ قورگ ئێشە یا زیانەکانی پێستی.

– بەکارهێنانی خواردەمەنیەکانی دەریایی‌و بەروبوومی هەڵگری یۆد دەبێ سنووردارbکرێت.

– دەرمان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

– هێماکانی بەکارهێنانی ناتەواوی دەرمان بریتین لە ترپەدڵ، سکچوون‌و تا.

– هێماو نیشانەکانی بەکارهێنانی لە رادەبەدەری دەرمان بریتین لە: ئاوسانی دەوروبەری چاو، بەرگەنەگرتنی سەرماو دابەزینی توانایی زەین.

**متۆکاربامۆل METHOCARBAMOL**

● ناوی بازرگانی: Robaxin

● گرووپی دەرمانی: شلکەری ماسوولکەکانی ئێسکەپەیکەر.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠٠ ملگم‌و ئەمپوولەکانی ١گم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: بۆ چارەسەری ژان‌و ئسپاسمەکانی ماسوولکەیی.

ڕێژەی بەکارهێنان:

پێگەیشتووان: ١ تا ٥ گم ڕۆژانە ٤ جار بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی - سنکوپ. گرژی - هێڵنج، کەمبوونی ڕێژەی ترپەکانی دڵ.

خارش - لووت گیران.

*پارێزگاریەکان: پێشینەی گرژی‌و ناڕیکی گورچیلە.

● فێرکردنی نەخۆش:

– لە ماوەی چەند خولەك‌و بە هێواشی دەرمانی شلکرا و بە شێوەی دەرزی لێ بدرێت.

– لەوانەیە لە ماوەی دەرمان ڕەنگی میز بۆ سەوز، ڕەش یان قاوەیی بگۆڕدرێت.

– سوود لە ئەلکهول وەرنەگیرێت.

## مێتۆترۆکسات METHOTREXATE

- ناوی بازرگانی: Abitrexate
- گرووپی دەرمانی: دژی شێرپەنجە، دژی رۆماتیزم.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢.٥ ملگم و ئەمپوول.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D.
- بەکارهێنان لە شیردان: دەبێ شیردان رابگیرێ.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری شێرپەنجەکان - ئارتریت روماتۆئید، پسوریازیس.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشک بەکاربهێنرێت.

*بەکارنەهێنان: ناهاوسەنگی یەکانی خوێن - ناڕێکی جگەرو گورچیلە.

- زیانە لاوەکییەکان: کەم خوێنی - دمانس ، بێ ئۆقرەیی، هێڵنج، سکچوون. کون بوونی ریخۆڵە، ناڕێکی جگەر، زیادبوونی ئەسیدئۆریکس خوێن.

*پارێزگاریەکان: هەوکردن، برینی گەدە، بەدخۆراکی تاکەکانی بەساڵاچوو.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لە هەر چەشنە: پاشەڕۆی قیڕاوی، تا، لەرز، خوێن بەربوون، شین هەڵگەڕان، کۆکە.

– هەڵوەرینی مو لە ماوەی چارەسەری بەدی دێت.

– لەو کاتەی کە هەوکردن و سووربوونی دەم روودەدات لە بەکارهێنانی خواردنەکانی گەرم، ڕەق و هەلگری ئەسیدسیتریك خۆتان بپارێزن.

– لە ماوەی چارەسەری و دوو مانگ پاش بەکارنەهێنانی دەرمان نابێ سکپڕبن.

– ڕێژەی بەکارهێنانی شلەمەنیەکان زیاد بکەن.

## متیل دۆپا METHYLDOPA

- ناوی بازرگانی: Dopamet
- گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.
- بەکارهێنان لە شیردان: باشتروایە نەدرێت.

*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی خوێن بەتایبەت کاتی سکپڕی.

- ڕێژەی بەکارهێنان: بە ٢ حەب دەست پێ دەکرێ‌و تا ٨ حەب دەکرێ زیاد بکرێ.

*بەکارنەهێنان: ناهاوسەنگی جگەر، نەخۆشی ئەکتیڤی جگەر.

- زیانە لاوەکییەکان: خەمۆکی، سەرسووڕان، سەرئێشە، ئاوسان، سکچوون، کەم خوێنی، وشکی دەم‌و لووت، کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکان، زەردی، ژانی ماسوولکەو جومگە.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان لەناکاو ڕانەگیرێ.

– پزیشك لەم دۆخانە ئاگاداربکەنەوە دەم کولی ـ قورگ ئێشە ـ ئاوسانی دەست‌و پێ، ژانی سینگ، ترپەکانی نارێکی دڵ.

– لەماوەی چەند ڕۆژی یەکەمی چارەسەریدا لەوانەیە سەرسووڕان‌و بوورانەوە ڕووبدات.

## میتیل پردنیزۆلۆن METHYL PREDNISOLONE

- ناوی بازرگانی: Depomedrol
- گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن.
- شێوەی دەرمانی: دەرزی لێدان.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری دژی هەوکردن لە ڕۆماتیزمدا، خوران، پسوریازیس.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: بــەپێی ویســتی پزیشك.

*بەکارنەهێنان: هەوکردنی کەپووی.

● زیانــە لاوەکییــەکان: بــێ خــەوی، سەرخۆشی، نارێکی دڵ، ئاوسانی لەش، زیادبوونی ئـارەزووی خـواردن، زیپکـە، ژانی جومگەو لەش، زیادبوونی شـەکری خوێن.

فێرکردنی نەخۆش:

– نـابێ بـەکارهێنانی دەرمـان لـەناکاو رابگیرێ.

## متۆکلۆپرامید METOCLOPRAMID

● ناوی بازرگانی: Plasil

● گرووپــی دەرمـانی: دژی هێڵـنج، دژی ڕشانەوە.

● شـێوەی دەرمـانی: حـەبو ئـەمپوولو دڵۆپ.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی B.

بەکارهێنان لـە شـیردان: سوودەکانی لـە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بــەکارهێنان: ڕشــانەوە ـ گەڕانــەوەی ئەسیدی گەدە بۆ سورێنچك.

*ڕێــژەی بــەکارهێنان: ١ تــا ١.٥ حــەبی خـۆراکی ڕۆژانـە ٤ جار ٣٠ خولـەك پـێش خواردن.

*بەکارنەهێنان: خـوێن بـەربوونو گیرانـی ڕیخۆڵـە پارکینسـۆن، نـارێکی گورچـیلەو جگەر ـ گرژی.

● زیانــە لاوەکییــەکان: پەشـێوی، بــێ ئـۆقرەیی، سەرسـووڕان، سەرئێشـە، تـا، ئسپاسـمو لاربـوونی دەمو مـل لــەکاتی بەکارهێنان.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل.

– خۆپاراستن لە بـەکارهێنانی ئـەلکهولو دەرمانەکانی خەوهێنەر.

– بەکارنــەهێنانی دەرمــان لــەو کاتــەی ئسپاسـمو لاربـوونی دەم یـان مـل بـەدی بێت.

## مترۆنیدازۆل METRONIDAZOLE

● ناوی بازرگانی: Flagyl

● گرووپی دەرمانی: دژی باکتری، دژی ئامیب.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥٠ ملگم . حەب و ژلی واژینال و شەربەت.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی B.

بەکارهێنانی لە شیردا: لە کاتی چارەسەری دەبێ شیردان ڕابگیرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری هەوکردنەکانی میکرۆبی سکچوونی خوێن - هەوکردنەکانی ناو سك.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە هەوکردنەکانی ئاسایی: یەك حەب هەر ٨ کاتژمێر.

لە ئامیب: ٣ حەب ٢٥٠ ملگم هەر ٨ کاتژمێر لە ماوەی ٥ تا ١٠ ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: سێ مانگی یەکەمی سکپڕی، نەخۆشی ئەکتیڤی دەماغ، ناهاوسەنگی توندی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە و سەرسووڕان، خەمۆکی، لاوازی، گرژی بێ ئۆقرەیی، لیر، خوران، ژانی سك قەبزی، وشکی دەم، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی، کەمبوونی خانەکانی خوێن هەستکردن بە سووتانەوە لە ڕێڕەوی میزدا.

فێرکردنی نەخۆش:

– باشتروایە دەرمان بە گەدەی بەتاڵ بەکاربهێنرێت.

– لەوانەیە میز بۆ ڕەنگی قاوەیی یان سوور بگۆڕدرێت.

– ماوەی دەرمانەکە تەواو بکرێت.

– لە هەوکردنی ئافرەتان دەبێ هاوسەری نەخۆشیش چارەسەر بکرێت.

– گرژی و گێژی هێمای ژارانگەزی نەخۆشە.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول و تا ٤٨ کاتژمێر پاش بەکارهێنانی دەرمان.

## متوپرولول METOPROLOL

- ناوی بازرگانی: Metoral
- گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێنی بەرز، چارەسەری یارمەتیدەر لە وەستانی دڵ.
- شێوەی دەرمانی: لە ئێران تەنیا حەبەکانی ٥٠ ملگم هەن.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گروپیC.

بەکارهێنان لە شیردان: بە وریاییی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی سووکو مام ناوەند، چارەسەری یارمەتیدەر لە نەخۆشی دەمارەکانی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان: ژەمی ئاسایی ٥٠ تا ١٠٠ ملگم.

لە ژەمەکانی دابەشکراو لایەنی زۆر ژەمەکە ٤٠٠ ملگم.

*بەکارنەهێنان: ترپەکانی دڵ کەمتر لە ٥٠ تا ٦٠، پاڵەپەستۆی نزم، ناڕێکی دڵ.

- زیانە لاوەکییەکان: خەمۆکی، سەرسووڕان، خەواڵوویی، شەکەتی، کەمبوونی ترپەکانی دڵ، ناڕێکی دڵ، قەبزی، بای سك، تەنگە ڕێڕەوی هەوا.

فێرکردنی نەخۆش:

- نابێ دەرمانەکە ڕابگیرێو لە ماوەی ٢ مانگ ڕابگیرێ.
- هێماکانی خوارەوە پێشاندەری ناڕێکی دڵەو دەبێ پزیشك ئاگاداربکرێت: تەنگە نەفەسی بە تایبەت لە کاتی چالاکی یان کاتی خۆدرێژکردن، کۆکەی شەوانە، ئاوسانی ئەندامەکان.

## می پرامین MIPIRAMIN HCL

- ناوی بازرگانی: Tofranil
- گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی سێ ئەڵقەیی.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠و ٢٥و٥٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.

● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵبسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: خەمۆکی، شەوانە میزکردنی منداڵان، پەشێوی، ناهاوسەنگی یەکانی پێش سووڕی مانگانە.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە خەمۆکی پێگەیشتووان: ٧٥ تا ١٠٠ ملگم خۆراکی لە ژەمەکانی دابەشکراو.

لە شەوانە میزکردنی منداڵان: ٢٥ تا ٧٥ ملگم ڕۆژانی خۆراکی یەك کاتژمێر بەرلەنووستن.

*بەکارنەهێنان: قۆناغی چاك بوونەوەی لە پرۆستاتی دڵ، ناهاوسەنگیەکانی گرژی، گەورەیی پرۆستات.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، لاوازیو گرژی، وشکی دەم، ناهاوسەنگی دڵ، قەبزی، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەستپێکی کاریگەرییکانی دەرمان لەوانەیە ٢ تا ٣ هەفتە بخایەنێ.

– دەرمان نابێ لە ناکاو ڕابگیرێ.

– کۆنترۆڵ کردنی پاڵەپەستۆی خوێنو شتەکانی جگەرو گورچیلە پێویستن.

– خۆپاراستن لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستی بە وشیاری تەواو هەیە.

## میکونازول MICONAZOLE

● ناوی بازرگانی: Dakt Arin

● گرووپی دەرمانی: دژی کەڕوو.

● شێوەی دەرمانی: کرێمی شوێنو ناوەوەی زێ.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری هەوکردنەکانی کەڕووی پێستو نینۆکو هەوکردنی ئافرەتان.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: ڕێگری بەکارهێنانی نیە.

● زیانە لاوەکییەکان: خوران، سووتانەوە.

فێرکردنی نەخۆش:

- ماوەی دەرمانو چارەسەری لە ٢ هەفتە تا ٦ مانگ جیاوازە.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

**ماینوکسیدیل MINOXIDIL**

● گرووپی دەرمانی: جوولێنەری گەشەی موو.

● شێوەی دەرمانی: گیراوەکانی ٢، ٣، ٤، ٥لە سەدا.

بەکارهێنان لە سکپڕیدا: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری هەڵوەرینی موو بەدیهاتوو لە کەمبوونی پیاوانە.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ سی سی ڕۆژانە ٢ جار لە شوێنەکە.

*بەکارنەهێنان: هەوکردنی پێستی سەر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، خەمۆکی، ئاوسان، ژانی سینگ، ئەکزیماو خوران، سکچوون، کەمبوونی پلاکتەکان، ناتوانایی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- ڕاگرتنی بەکارهێنانی دەرمانەکە مەترسیدارە.

**مۆرفین MORPHIN**

● گرووپی دەرمانی: سڕکەر و دژی ژان.

● شێوەی دەرمانی: حەب، فتیل، ئەمپوول.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: لایەنی کەم ٢ تا ٣ کاتژمێر پاش بەکارهێنانی دەرمان، دایك نابێ شیر بە منداڵەکەی بدات.

*بەکارهێنان: ژانەکانی ناوەند و توند.

ڕێژەی بەکارهێنان: گرێدراوە بە توندی ژانەکە ٤ تا ١٥ ملگم.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری لە ڕاددەبەدەر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرخۆشی، سەرئێشە، ترپەدڵ، وشکی دەم، هێڵنج، ڕشانەوە، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی، میزگیران، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، بێ ئۆقرەیی.

*پارێزگاریەکان: نارێکی هەناسە، گیرانی ڕێگەی هەوا، گرژی، کەم کاری تیروئید، زەڕیە لە سەر.

فێرکردنی نەخۆش:

- لە سوود وەرگرتنی درێژخایەن لەوانەیە مودمین بوون بەدی بێت.
- هێماکانی ڕاگرتنو بەکارنەهێنانی دەرمانەکە بریتین لە: هێڵنج، ڕشانەوە، ژانی سک، تا، لاوازی، کەمبوونی ئارەزووی خواردن.



## موپیرۆسین
## MUPIROCIN

- ناوی بازرگانی: Bactroloam
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بایوتیک.
- شێوەی دەرمانی: مەرحەم.
- بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی B.

بەکارهێنانی لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: زەرپیز.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٣ جار.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری زۆر.

- زیانە لاوەکییەکان: سووتانەوە، خوران، سەرئێشە، کۆکە.

*پارێزگاریەکان: سووتان، ناهاوسەنگی گورچیلە، برینە گەورەکان.

*فێرکردنی نەخۆش:

- ئەگەر پەرچەکرداری هەستیاری بەدی بێت دەرمانەکە بەکارنەهێنرێت.

# N

## ناليت ديكسيك ئەسيد
## NALIDIXIC ACID

- ناوی بازرگانی: Negram
- گرووپـی دەرمـانی: دژی هـەوکردنی میزڵدان‌و بۆڕی میز.
- شێوەی دەرمانی: حـەبی ٥٠٠ ملگم‌و شەربەتی ٦٠ ملگم لەهەر سی سی دا.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بـەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی دەرمـان لـە بەرامبـەر زیانـەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بـەکارهێنان: هـەوکردنی تونـدو درێژخایەنی میزڵدان‌و بۆڕی میز.

ڕێژەی بەکارهێنان:

لە پێگەیشتووان: ١گم ڕۆژانـە ٤ جار بۆ ماوەی ٧ تا ١٤ ڕۆژ.

*بەکارنـەهێنان: پێشـینەی گـرژی سـێ مـانگی یەکـەمی سـکپڕی، کـەمبوونی ئـەنزیمی PD6G، شـیرخۆرەکانی بچووکتر لە سێ مانگ.

- زیانـە لاوەکییـەکان: سەرئێشـە، سەرسووڕان، لاوازی، خـەواڵوویی، گـرژی، خـوران، سکچـوون، هێڵـنج، تـا، تـاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

- تسـتەکانی خـوێنی وەکـو ئانزیمـەکانی جگەر و ژماردنی خانەیی ئەنجام بدرێت.
- بەکارنـەهێنانی دەرمـان لـە کـاتی سکچوونی توند.
- ئاگادارکردنـەوەی پزیشـك لـە قـوڕگ ئێشە، شین هەڵگەڕان، خوێن بـەربوون، ژانەجومگـە، چـونکە لەوانەیـە هـۆی دیسکرازی خوێن بێت.

ناندرۆلۆن NANDROLONE

● ناوی بازرگانی: Durabolin

● گرووپــــی دەرمـــــانی: ئانابولیـــــك (پێكهێنەر).

● شـێوەی دەرمـانی: ئەمپوولـەكانی ٢٥ ملگم.

● بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی X.

بـەكارهێنان لـە شـیردان: سـوودەكانی دەرمـان لـە بەرامبـەر زیانـەكانی دەرمـان هەڵدەسەنگێنرێت.

*بەكارهێنان: كەم خوێنی بەدی هاتوو لە نەخۆشی گورچیلە، لـەوەرزش وانەكانـدا زیادكەری قەبارەی ماسوولكەكان.

ڕێژەی بەكارهێنان:

لە پیاواندا: ١٠٠ تا ٢٠٠ ملگم هەر هەفتە.

لە ئافرەتاندا: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم هەر هەفتە.

*بەكارنـەهێنان: نەخۆشـی جگـەر و دڵ، خـوێن بـەربوونی منداڵـدان بـە هۆیـەكی نادیـار، شـێرپەنجەی مـەمك، لـە پیـاوان شێرپەنجەی پرۆستات.

● زیانــە لاوەكییــەكان: ئەســتووربوونی دەنگ لە ئافرەتاندا، گـەورەبوونی چۆكو بچـوكبوونی گونـەكان لــە پیــاوان دا، كـەمبوونی ئـارەزووی سێكسـی، زیپكـە، پێستی چەور، هێڵنج، زیـادبوونی كێش، نــاڕێكی ســووڕی مانگانــە، زیــادبوونی كالسیۆمی خوێن، سەرئێشە.

فێركردنی نەخۆش:

- هێماكـانی میـز زۆر - زۆرخواردنـەوە، هێڵـنج، ڕشـانەوە، قـەبزی، دەتوانێـت بەیانكـەری زیـادبوونی كالسـیۆمی خـوێن بێت.

- دەرمـــان دەبـــێ لەگـــەڵ وەرزش - پشـــوودانو پـــارێزكردنی خواردەمـــەنی گونجاو هاوڕێ بكرێت.

**نفازۆلین NAPHAZOLINE**

● ناوی بازرگانی: Vasocon

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی گـــیران و وێکهێنەری دەمارەکان.

● شێوەی دەرمانی: دڵۆپەکانی ئستریلی چاو و لووت.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بـەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی دەرمـــان لـــە بەرامبـــەر زیانـــەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بـەکارهێنان: گـیران، خـورانی چـاو، لابەری گیرانی لووت.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ١ تـا ٢ دڵـۆپ لـە هەرچاودا هەر ٣ تا ٤ کاتژمێر.

*بەکارنـەهێنان: پاڵەپەسـتۆی بـەرزی ناوەوەی چاو.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرئێشـــە، سەرســـووڕان، پـــژمین، ســـووتانەوە، زیادبوونی پاڵەپەستۆی ناوەوەی چاو.

فێرکردنی نەخۆش:

- لـە دڵـۆپی لـووت زیـاتر لـە ٢ تـا ٥ ڕۆژ سوود وەرنەگیرێ.

- پاش هەر جار سوود وەرگرتن لە دڵۆپی لـووت پێویسـتە سـەری دڵۆپەچـکان بـە ئـاوی گـەرم بشـۆردرێت تـا گریمانـەی گواستنەوەی ئالوودەیی کەم بێت.

**ناپرۆکسن NAPROXEN**

● ناوی بازرگانی: Naprosyn

● گرووپـی دەرمـانی: دژی ئـێش و دژی هەکردنی نائستروئیدی.

● شـێوەی دەرمـانی : حەبـەکانی ٢٥٠ و ٥٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سپکڕیدا: گرووپی B.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردریت.

*بـــەکارهێنان: ئـــارتروز، ڕۆمـــاتیزم، ژانەکانی جومگەیی، هەوکردنەکانی لووت، گوێ، سینگ، ژانی ددان.

*بـەکارهێنان: خـوێن بـەربوونی تونـدی کۆئەندامی هەرس کـردن، برینـی گـەدەی ئەکتیف، سیێ مـانگی سـێیەمی سـکپڕی، تەنگەنەفەسی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، سەرئێشە، خوێن لە میزدا، قەبزی، هێڵنج، ئاوسانی ئەندامەکان، بێ خەوی، زیانەکانی گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

- بۆ کەم کردنی زیانەکانی لاوەکی گەدە دەرمان بە یەك پەرداغ ئاو، شیر، شەربەتی ئەلمینیۆم، بارانیستدین سوود وەربگیرێ.

- لەوانەیە دەستپێکی کاریگەری دەرمان یەك مانگ بخایەنێ.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هاوکاتی ئەلکهول و ئەسپیرین.

## ئەسید نیکۆتینیك

## NICOTINIC ACID

● گرووپی دەرمانی: کەمکەرەوەی چەوری خوێن، والآ کەرەوەی دەمارەکان.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥، ١٠٠ و ٥٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی A.

بەکارهێنان لە شیردا: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: بەرزبوونی ڕێژەی چەوریەکانی خوێن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٦گم خۆراکی ڕۆژانە دابەشکراو بۆ ٢ تا ٤ ژەم هاوڕێ یان پاش خواردن.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر، نەخۆشی جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، ئەکتیف بوونی برینی گەدەو دوازدەگرێ.

فێرکردنی نەخۆش:

- تا چەند کاتژمێر پاش وەرگرتنی دەرمان بە شێوەی خۆراکی دۆخی گەرمی و گڕگرتن بەدی دێت.

٢ هەفتە پاش دەستپێکی چارەسەری ئەم هێمایانە کەم دەبن.

## نیفدپین NIFEDIPINE

● ناوی بازرگانی: Adalat
● گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن، دژی ئەنژین.
● شێوەی دەرمانی: حەب و کەپسوولەکانی ١٠و ٣٠ ملگم. حەبەکانی ٢٠ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.
*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی خوێن.
ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ ملگم ڕۆژانە ٣ جار لایەنی زۆری ژەمەکە ڕۆژانە ١٢٠ ملگم.
*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، وەستانی دڵ. لەم دواییەدا ناڕێکی دڵو گورچیلە.
● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، ئاوسانی ئەندامەکان، ناڕێکی دڵ، سکچوون، هێڵنج، تەنگە نەفەسی، گیرانی لووت، وشکی دەم، میزکردنی شەوانە.
فێرکردنی نەخۆش:
- ئەم دەرمانە دەتوانی ببێتە هۆی سەرسووڕان بۆیە لە ئەنجامدانی چالاکییەکانی مەترسیدار خۆتان بپارێزن.
- سەرسووڕان، ترپەی دڵ، هێڵنجو ڕشانەوەی توند و پاڵەپەستۆی خوێنی بەرز هێماکانی ژارانگەزین.

## نیترۆفورانتۆین NIROFURANTOIN

● ناوی بازرگانی: Furadantin
● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی میزڵدانو بۆڕی میز.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.
بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمانەکە لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.
*بەکارهێنان: هەوکردنەکانی میزڵدانو بۆڕی میز.
ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم خۆراکی ٤ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: نارێکی گورچیلە.

● زیانە لاوەکییەکان: بێ هەستیو تەزینی ئەندامەکان، سەرسووڕان، سەرئێشە، خەواڵوویی، هێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، ژانە سك، خوران، تەنگەنەفەسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەوانەیە دەرمان ببێتە هۆی خەواڵوویی.

- لە نەخۆشەکانی شەکرەدا ئاستی گلوکۆزی خوێن دەبێ کۆنترۆڵ بکرێ.

- لەوانەیە ڕەنگی میز بۆ زەردی تۆخ یان قاوەیی بگۆڕدرێت.

- لەوانەیە کە ڕەنگی ددانەکان بگۆڕدرێت.

## نیترۆفورازۆن nitrofurizon

● ناوی بازرگانی: Furacin

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بایوتیك.

● شێوەی دەرمانی: کرێم.

● بەکارهێنان لە سکپڕدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنەکانی سەرەوەی پێستو سووتان.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە شوێنی زیان پێگەیو ڕۆژانە یەك جار بماڵدرێت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

*پارێزگاریەکان: کەمبوونی ئانزیمی pd6g و ناهاوسەنگی گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە پەیوەندی دەرمانەکە لەگەڵ چاودا.

- ئاگادارکردنی پزیشك لە هەستیاری پێست یان هەوکردن.

## نیترو گلیسرین nitroglycerin

● ناوی بازرگانی: Nitrocontin

● گرووپــی دەرمــانی: دژی ئــێش، دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شــێوەی دەرمــانی: حــەب، ســپرا، تەزریقی، مەرهەم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

بەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی لـە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: کـەم کردنـەوەی ژانـی دڵ، پێشگیری کردن لە پەلامارەکانی دڵ.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: بـۆ کـەم کردنـەوەی ژانـی سینگەکوژی ١ حـەب لـە ژێـر زمـان هەر ٥ خولەك یـەك جـار تـا ٣ ڕۆژ ئەگـەر چـاك نەبوونــەوە ســەردانی نەخۆشــخانە بکەن.

*بەکارنــەهێنان: دابــەزینی پاڵەپەســتۆی خوێن، کەم خوێنی توند، خوێن بەربوونی دەماغ.

● زیانە لاوەکییەکان: لاوازی، سەرئێشە، سەرسووڕان، ترپەی دڵ، وشکی دەم.

فێرکردنی نەخۆش:

- دەبێ حەبی ژێر زمانی لە نێـوان گۆنـا و پـوو یـان بـەینی لێـو و پـووی سـەرەوەی ددانەکانی پێشەوە دابنێ.

- دەبـێ لـە بـن زمانـەوە سـوود لـە سـپڕا وەربگیرێ.

- حــەب لــە دەفــری ســەرەکی خــۆی هەڵبگیرێ.

- لــە ســەرەتای چارەســەریدا سەرئێشــە بەدی دێت.

## نورترپتیلین nortriptyline

● ناوی بازرگانی: Arentyl

● گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی.

● شێوەی دەرکانی: حەبـەکانی ١٠و ٢٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.

● بـەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی دەرمــــان لــــە بەرامبــــەر زیانــــەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بــەکارهێنان: خــەمۆکی، ژانــە لاســەر (میگەرین)، میزکردنی شەوانە.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە دەست پێکدا ۲٥ ملگم خۆراکی ۳ تا ٤ جار لایەنی زۆر ڕۆژانە ۱٥۰ ملگم.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، وەستانی دڵی ئەم دواییە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، لاوازی، ناهاوسەنگی لە ترپەکانی دڵ، وزەوزی گوێ، تاری بینین، وشکی دەم، سکچوون، هەستیاری بە ڕووناکی.

*پارێزگارییەکان: نەخۆشییەکانی دڵ، نەخۆشییەکانی هەناسە، ئەلکلیسمو گیرانی میز، گەورەیی پرۆستات.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەوانەیە دەستپێکی کاریگەری دەرمان ۲ تا ۳ هەفتە بخایەنێ.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هاوکات لەگەڵ ئەلکهول.

- ئاگادارکردنی پزیشك لە میزگیران.

## نیساتین nystatin

● گرووپی دەرمانی: دژی کەڕوو.

● شێوەی دەرمانی: دڵۆپ، حەبی واژینال.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: مەترسیدارنەبوونی دەرمانەکە نەسەلمێندراوە.

*بەکارهێنان: چارەسەری کەڕوو.

ڕێژەی بەکارهێنان: ۱۰ دڵۆپ هەر ۳ تا ٤ کاتژمێر لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، سکچوون.

فێرکردنی نەخۆش:

- ماوەی دەرمان تەواو بکرێت.

- لە هەرچەشنە واژینالێ تا ئەو کاتەی کە چارەسەری تەواو نەبووە نابێ جووتبوون ئەنجام بدرێت.



## OFLOXACIN ئۆفلۆکساسین

- ناوی بازرگانی: Tarivid
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بایوتیك.
- شێوەی دەرمانی: حەبی ٢٠٠و ٣٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: لە کاتی چارەسەریدا دەبێ شیردان ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: سکچوون، هەوکردنی ئێسكو جومگەکان، هەوکردنی میزڵدانو بۆری میز.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٤٠٠ تا ٨٠٠ ملگم خۆراکی ڕۆژانە ٢ جار.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، منداڵان.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، گرژی، خەواڵوویی، ترپەی دڵ، هەستیاری بە ڕووناکی، وشکی دەم، ژانی جومگە، تەنگە نەفەسی، هێڵنج.

پارێزگارییەکان: گەشکە، ناهاوسەنگییەکانی دەماغ.

فێرکردنی نەخۆش:

- هاوڕێ لەگەڵ دەرمان سوود لە ئەنتی ئەسید وەربگیرێ.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هاوکاتی ئاسن یان بەروبوومی هەڵگری کەرەستەی کانزایی ٢ کاتژمێر بەر و ٢ کاتژمێر پاش بەکارهێنانی دەرمان.
- بەکارهێنانی شلەمەنییەکان زیاد بکرێت بۆ ڕێگرتن لە لمی گورچیلە.

## OLANZAPINE ئۆلانزاپین

- ناوی بازرگانی: Zyprexa
- گرووپی دەرمانی: دژی شێتایەتی.
- شێوەی دەرمانی حەبەکانی ٥ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: دۆخەکانی شڵەژاوی و ڕەواندن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠ ملگم ڕۆژانە یەك جارو لەکاتی زیادکردنی ژەم لایەنی زۆر ٢٠گم.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند.

● زیانە لاوەکییەکان: فەرامۆشی، پەشێوی، تووڕەبوون، زیادبوونی ژمارەی ترپەی دڵ، قەبزی، ڕشانەوە، دیاردەی وەکو ئەنفلۆنزا.

*پارێزگاریەکان: گەورەیی پرۆستات، نەخۆشی دڵ، نەخۆشی دەمارەکانی دەماغ.

فێرکردنی نەخۆش: - بەمەبەستی ڕێگرتن لە پاڵەپەستۆی خوێن لە خۆشوشتن بە ئاوی گەرم خۆتان بپارێزن.

- خۆپاراستن لە بەکارنەهێنانی لەناکاوی دەرمان.

- بەهۆی گریمانەی سەرهەڵدانی گەرماگەزی نابێ لە پێش تیشکی ڕابوەستن.

- بۆ ڕێگرتن لە دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن بە هێواشی دۆخەکەتان بگۆڕن.

## ئۆمیپرازۆل OMEPRAZOLE

● ناوی بازرگانی: Losec

● گرووپی دەرمانی: دژی چورانی ئەسیدی گەدە.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: لەکاتی چارەسەریدا شیردان دەبێ ڕابگیرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری برینی گەدە. گەڕانەوەی گەدە بۆ سورێنچك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٠ تا ٨٠ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانە لاوەکییەکان: خەمۆکی، تووڕەبوون، پەشێوی، ژانە قەفەسەی سینگ، ترپەی دڵ، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، ئاوسانی ئەندامەکان، ژانی گونەکان، ژانی جومگەکان، تاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

- لــەکاتی سکچــوونی تونــد دەرمانەکــە بەکارنەهێنرێت.

- لەوانەیە دابــەزینی شــەکر لــە تاکــەکانی نەخۆشی بەدی بێت.

٣ـ خۆپاراسـتن لەبــەکارهێنانی ئــەلکهول، ئەسپیرین‌و ئیبوپرۆفن.

**ئۆرلیستات ORLISTAT**

● ناوی بازرگانی: Xenical

● گرووپـــــی دەرمـــــانی: دەرمـــــانی کۆنترۆڵکردنی کێش.

● شــێوەی دەرمــانی: کەپســوولەکانی ٦٠و١٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.

● بەکارهێنان لە شیردان: نابێ بدرێت.

*بەکارهێنان: کۆنترۆڵی قەڵەوی.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: ٦٠ تــا ١٢٠ ملگــم خۆراکی ٣ جار لە ڕۆژ هاوڕێ لەگەڵ هــەر ژەمێکی خواردن لایەنی زۆر ٣٦٠ ملگم لــە ڕۆژدا.

*بەکارنـــەهێنان: کێشـــەکانی زەرداو، بەدهەڵمژین.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: بـــێ خـــەوی، خـــەمۆکی، پاشـــەڕۆ هـــاوڕێ لەگـــەڵ دڵۆپەکانی چـەوری‌و چۆڕان، هەسـتکردن بــە پاڵنــانی دەســت بــەجێی پاشــەڕۆی چەورو ڕۆناوی، ژانی کۆم، بێ ئیختیـاری پاشەڕۆ، ژانی پشت، ژانی جومگە.

*پارێزگاریـــەکان: کـــەمکاری تیروئیـــد، بـــــەردەکانی گورچـــــیلە، نەخۆشـــــی کۆئەندامی هەرسکردن.

فێرکردنی نەخۆش:

- مەترســـیدارنەبوون‌و کاریگەرنـــەبوونی دەرمانەکە زیاتر لە ٢ ساڵ نەسەلمێنراوە.

- دوو کاتژمێر بەر یان پاش بــەکارهێنانی دەرمــان لــە ڤیتامینــەکانی گــیراوە لــە چەوریدا سوود وەربگرن.

**ئۆکسازیپام OXAZEPAM**

● ناوی بازرگانی: Serax

● گرووپـــی دەرمــانی: دژی پەشــێوی، خەوهێنەر، هێمن کەرەوە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠ ملگم.

● بـــــەکارهێنان لـــــە ســــــکپڕیدا: ڕاناسپێردرێت.

*بـــــەکارهێنان: پەشـــــێوی تونـــــد، بەکارنەهێنانی ئەلکهول.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ١٥ ملگم ڕۆژانە ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنـــەهێنان: کۆمـــا، زیـــادبوونی پاڵەپەستۆی ناو چاو، شێتایەتی.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرســـووڕان، سەرئێشـــە، لـەرزین، کـەمبوونی ژمـارەی ترپـــەکانی دڵ، دابـــەزینی پاڵەپەســـتۆی خـوێن، تـــاری بیـــنین، قـــەبزی، هێڵـــنج، ڕشانەوە، ناهاوسەنگی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– ناکرێ ئەم دەرمانە بۆ ئسترسی ڕۆژانە یان زیاتر لە ٤ مانگ بەکاربهێنرێت.

– پـــاش چارەســـەری درێژخایـــەن نـــابێ بەشێوەی لەناکاو ڕابگیرێ.

– کۆنترۆڵکردنی تستەکانی خوێنی جگـەر پێویستە.

## ئۆکس بوئینین OXYBUYNIN

● ناوی بازرگانی: Ditropan

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی ئســـپاسمی بۆڕی میز.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.

● بـەکارهێنان لـە شـیردان: بـە وریـایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: دژی ئسپاسم بـۆ میزڵـدانی نوروورانیـــک، میزڵـــدانی لـــە ڕاددەبـــەدەر ئەکتیف.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ ملگم ٢ تا٣ جار لـە ڕۆژدا.

*بەکارنـــەهێنان: میاســـتنی گـــراویس - گیرانی ڕیخۆڵە، نارێکی گورچیلە.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: خـــەواڵوویی. سەرسووڕان، هێڵنج، قەبزی، تاری بینین و وشکی دەم.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە ئەنجامدانی چالاکیەکانی مەترسیدار، چونکە لەوانەیە سەرسووڕان و تاری بینین بەدی بێت.

– بێ ئاوریدانەوە لە ژەمی خواردەمەنی دەکرێ ئەم دەرمانە بەکاربهێنرێت.

**ئۆکسی توسین OXYTOCINE**

● ناوی بازرگانی: Syntocinon

● گرووپی دەرمانی: جوولێنەری چوونەیەکی منداڵدان.

● شێوەی دەرمانی: گیراوەکانی تەزریقی ٥٠ و ١٠ یەکە لە هەر میللتر.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دەرمان هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەڵوەشاندنەوەی لەبارچوون، کەم کردنەوەی خوێن بەربوون پاش منداڵبوون، یارمەتیدانی منداڵبوون، بۆ گرژی و زیادکردنی ماسوولکەکانی منداڵبوون، لەباری خاوی ماسوولکەکانی منداڵبوون لە کاتی منداڵبوون، پارێزگاری کردن لە ژانی منداڵبوون.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ٢٠ یەکە لە گیراوەی رینگر لاکتات.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، قەدەغەبوونی منداڵبوونی سروشتی.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، زیادبوونی خێرایی ترپەی دڵ، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، زیادبوونی جوولەکانی منداڵدان، گرژی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشک لە: زیادبوونی ڕێژەی خوێن بەربوون، زیادبوونی چوونەوەیەکی دەردناکی سک، تا، چۆرانی بۆنی نەخۆش لە زێ.

# P

## pancreatin پانکراتین

● ناوی بازرگانی: Dizymes

● گرووپی دەرمانی: هەرسکەر.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی هەڵگری ئامیلازو پرۆتیازو لیپاز.

● بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی ئەودا هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: نارێکی چورانی پانکراس، شێرپەنجەی پەنکریاس.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٣ حەب هاوڕێ لەگەڵ خواردن.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، هەوکردنی پانکراس بە شێوەی توند.

● زیانە لاوەکییەکان: سکچوون، ژانی سك، هێڵنج، هەبوونی خوێن لە میزدا، زیادبوونی ئەسید ئوریك لە خوێن دا.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان بەر لە خواردن بەکاربهێنرێت.

– خۆپاراستن لە وردکردن، جوین و شکاندنی دەرمان.

## pantoprazol پنتوپرازول سۆدیۆم

● ناوی بازرگانی: Pentozol

● گرووپی دەرمانی: کەم کەرەوەی ترشەلۆکی گەدە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٠و ٤٠ ملگم.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

*بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری نەخۆشی ریفلاکس، گەڕانەوەی ترشەلۆکی گەدە بۆ سورێنچك، چارەسەری برینی گەدە.

*ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٢٠ تا ٤٠ ملگم.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند.

*زیانــــە لاوەکییـــەکان: پەشــــێوی، سەرئێشــە، میگــەرین، ژانــی قەفەســەی سینگ، قەبزی، هێڵنج، دوبارەبوونـەوەی میز، سکچوون.

*فێرکردنی نەخۆش:

١ــ لــەکاتی سکچــوونی تونــد دەرمــان بەکارنەهێنرێت.

٢ـ خۆپاراستن لە بـەکارهێنانی ئـەلکهول، سالیسیلاتو ئیبوپرۆنن.

**پدیاتریك گریپ pediatric crip**

*نــــــــــــاوی بازرگـــــــــــــانی: Histopharmin

*گرووپـــی دەرمـــانی: دژی هەڵامـــەتی منداڵان.

*شێوەی دەرمانی: شەربەت.

* بـــەکارهێنان: هەڵامـــەتو زیـــادکردنی چۆراوەکانی لووتو سینوزیتی منداڵان.

*ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ تا ٨ سی سی ٣ تا ٤ جار لە ڕۆژدا.

*زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی.

*فێرکردنی نەخۆش:

١ــ بە هـۆی خـەواڵوویی دەبـێ چـاودێری منداڵ بکەن.

**پنسلین penicillin**

*گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك.

*شـێوەی دەرمــانی: حــەب، شــەربەت، تەزریقی.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕێپێدراوە.

*بەکارهێنان: چارەسەری هەوکردنـەکانی لەوزە - سی - سینۆزیت.

ڕێــژەی بــەکارهێنانی: بــەپێی ویســتی پزیشك جیاوازە، بەڵام لە قورگ ئێشـە لـە ژێر ٢٧ کیلۆگرام یەك پنـی سـیلین ٣، ٣، ٦، ســەرەوەی ٢٧ کیلـۆگرام یــەك پنــی سیلین ١٢٠، .... یەکە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: هەستیاری، هێڵنج، ڕشانەوە، گـرژی، پەرچـەکرداری پێسـت، تا.

فێرکردنی نەخۆش:

– پاش دەرزی لێدان نەخۆش دەبێ بۆ ماوەی ٣٠ خولەك لەژێر چاودێری بێت.

**پرفنازین perphenazine**

● ناوی بازرگانی: Trilafon

● گرووپی دەرمانی: چارەسەری ناهاوسەنگی توندی رەوانی.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢و ٤ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.

*بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: ناهاوسەنگی توندی دەروونی، پەشێوی توند، هێڵنج و ڕشانەوەی توند، خەمۆکی لەگەڵ پەشێوی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٤ تا ٨ ملگم ٣ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی دەمارەکانی دەماغ، کۆما.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی. سەرئێشە، دابەزینی کێشی لەش، کەم خوێنی، کەم بوونی ژمارەی پلاکتەکان و وشکی دەم.

فێرکردنی نەخۆش:

– خۆپاراستن لە بەکارنەهێنانی لە ناکاوی دەرمان.

– بەهۆی گریمانەی دابەزینی پاڵپەستۆی خوێن لە خۆشوشتن بە ئاوی گەرم خۆتان بپارێزن.

– پزیشك ئاگادارکردن لە کاتی قورگ ئێشە، نەخۆشی، تا، خوێن بەربوون و دەم کولی.

## فنازۆپیریدین phenazopyridine

- ناوی بازرگانی: Phenzodine
- گرووپی دەرمانی: دژی ژانی ڕێڕەوی میز.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.
- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری سووتانەوەی ڕێڕەوی میز.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب ڕۆژانە ٣ جار لەگەڵ خواردەمەنی.

*بەکارنەهێنان: نارێکی گورچیلە و جگەر.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، هێڵنج، کەم خوێنی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە ڕەنگی میز بۆ ڕەنگی نارنجی دەگۆڕێ.

– پاش بەکارهێنانی خواردن ئەم دەرمانە بەکاربێنن.

## فنۆباربیتال phenobarbital

- ناوی بازرگانی: Barbita
- گرووپی دەرمانی: دژی گرژی.
- شێوەی دەرمانی: حەبو ئەمپوولەکانی تەزریقی.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.
- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری گرژی، هێمن کەرەوە، بێ خەوی.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك جیاوازە.

*بەکارنەهێنان: نارێکی گورچیلە و جگەر، نەخۆشی توندی کۆئەندامی هەناسە.

- زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، سەرسووڕان، ناهاوسەنگی کۆئەندامی هەناسە، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، هێڵنج، کەم بوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ، سەرئێشە، بێ ئۆقرەیی، پەشێوی.

فێرکردنی نەخۆش:

– بەهۆی بەدیهاتنی خەواڵوویی لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستی بە وشیاری تەواو هەیە خۆتان بپارێزن.

– نابێ بەکارنەهێنانی دەرمان لەناکاو ڕابگیرێ.

– دەستپێکی کاریگەری دەرمان بە شێوەی خۆراکی دەتوانێت ٢ تا ٣ هەفتە بخایەنێت.

**فنیل ئەفرین phenylephrine**

● گرووپی دەرمانی: دژی گیران و تەسک کەرەوەی دەمارەکان.

● شێوەی دەرمانی: دڵۆپی لووت ٠.٢٥ تاکو ٠.٥٪ .

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی c.

*بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری گیرانی لووت.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ تا ٣ دڵۆپ هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی دەمارەکانی دڵ، پاڵەپەستۆی بەرزی خوێن، بەرزبوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، بەرزبوونی پاڵەپەستۆی خوێن و ترپەکانی دڵ، تاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان نابێ زیاتر لە ٤ ڕۆژ لە سەریەك سوودی لێ وەربگیرێ.

– ئاگادارکردنی پزیشك لە سەرهەڵدانی بێخەوی، سەرسووڕان، لەرزین.

**فنیۆتین phenytoin**

● ناوی بازرگانی: Dilantin

● گرووپی دەرمانی: دژی پەرکەم.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ١٠٠ ملگم، ئەمپوولەکانی ٢٥ ملگم، شەربەتەکانی ٣٠٠ ملگم لەهەر سی سی.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی d.

بەکارهێنان لە شیردان: لە ماوەی چارەسەری دەبێ شیردان ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: گرژی، نزگەرەی بەردەوام.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك جیاوازە.

*بەکارنەهێنان: بلۆکەکانی دڵ، نزمبوونی ڕێژەی ترپەکانی دڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، تووڕەبوون، کەمبوونی پاڵەپەستۆی خوێن، زیانەکانی پێست، کەمبوونی ژمارەی خانەکانی دڵ، هەوکردنی جگەر، بەرزبوونی ڕێژەی شەکری خوێن، گەورەبوونی پووەکان، پرمویی.

*پارێزگاریەکان: ناهاوسەنگی کارکردنی گورچیلە، نەخۆشی شەکرە، دابەزینی پاڵەپەستۆی خوێن، ناڕێکی دڵ، تاکەکانی بەتەمەن.

فێرکردنی نەخۆش:

– لە تاکەکانی تووشبوو بە نەخۆشی شەکرە، دەبێ شەکری خوێن کۆنترۆڵ بکرێ.

– لەوانەیە ڕەنگی میز بۆ ڕەنگی پەمەیی بگۆڕدرێت.

– نابێ بەکارهێنانی دەرمانەکە لەناکاو ڕابگیرێ.

– بە شێوەی ڕێك و پێك بە سوود وەرگرتن لە سیواکی نەرم ددانەکان بشۆن و لە بەنی ددان بە مەبەستی ڕێگرتن لە گەورەبوونی پووەکان سوود وەربگرن.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

– لەوانەیە دەرمانەکە ببێتە هۆی خەواڵوویی.

*خاڵێکی گرنگ: جۆرێکی کرمی شوێنی (فنیتۆئین) بۆ چاکبوونی خێرای برینەکانی پێستی سوودی لێ وەردەگیرێ.

## پیۆگلیتازۆن PIOGLITAZONE

● ناوی بازرگانی: Actos

● گرووپی دەرمانی: دژی نەخۆشی شەکرە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٥، ٣٠، ٤٥ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

*بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری پێکهاتە لەگەڵ دەرمانی تری دابەزێنەری شەکری خوێن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١٥ تا ٣٠ ملگم لە ڕۆژ.

*بەکارنەهێنان: نەخۆشی شەکرە، جۆری یەکەم (وابەستە بە ئەسمولین)، نەخۆشی ئەکتیفی جگەر، زیادکردنی ئانزیمەکانی جگەر ١.٥ تا ٢ بەرابەری سروشتی.

پێشینەی زەردەیی.

فێرکردنی نەخۆش:

– نابێ بەکارهێنانی دەرمان لە ناکاو ڕابگیرێ.

– ئاگادارکردنی پزیشک لە هێماکانی ناهاوسەنگی کارکردنی جگەر، هێڵنج، ڕشانەوە، پژانی سک، شەکەتی، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، میزی تۆخو زەردەیی.

## piprazine پیپرازین

● ناوی بازرگانی: Anterpar

● گرووپی دەرمانی: دژی کرم.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠٠ ملگمو شەربەتەکانی ٧٥٠ ملگم لە ٥ سی سی.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

*بەکارهێنان لە شیردان: بێ مەترسی بوونی ئەم دەرمانە لە شیردان نەسەلمێنراوە.

*بەکارهێنان: کرمەکانی خڕ یان نماتودەکان(ئەسکاریس، کرمۆک، ئسترۆنژیاوس).

ڕێژەی بەکارهێنان: لە کرمەکانی شێوەی بەن: ٦٥ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش ڕۆژانە بۆ ماوەی ٧ تا ٨ ڕۆژ.

لە کرمەکانی ئەسکاریس: لەپێگەیشتووان ٣.٥گم ڕۆژانە یەك ژەم ٢ ڕۆژ لەسەریەك.

*بەکارنەهێنان: گرژی، ناهاوسەنگی کارکردنی جگەر و گورچیلە.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، گرژی، سەرئێشە، تاری بینین، کۆکە، کەمبوونی بینین، لیر.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەگەر هێماکانی تووڕەبوون بەدەرکەوتن نابێ دەرمانەکە بەکاربهێنرێت.

– ئاگاداركردنی پزیشك لە: لیر، کۆکەکانی خڵت دار، تەنگە نەفەسی.

## پیراستام piracetam

● ناوی بازرگانی: Nootopil

● گرووپی دەرمانی: جوولێنەری دەماغ.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٨٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: زیان گەیشتن بە دەمارەکانی دەماغ، ناهاوسەنگی لە بەبیرهاتنەوە لە تاکەکانی بەتەمەن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە ٣ حەب لە ژەمەکانی دابەشکراو.

*بەکارنەهێنان: نارێکی توندی گورچیلەو جگەر.

● زیانە لاوەکییەکان: خەواڵوویی، خەمۆکی، بێ ئۆقرەیی، گرژی، سەرئێشە، سکچوون، زیادکردنی کێشی لەش.

## پیرۆکسیکام piroxicam

● ناوی بازرگانی: Feldene

● گرووپی دەرمانی: دژی تا، دژی هەوکردن.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوول ١٠ ملگم، ئەمپوول ٢٠ ملگم. ژل.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C .

● بەکارهێنان لە شیردان: لە ماوەی چارەسەریدا دەبێ شیردان ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: ژانی ماسوولکە، ئارتریت، ڕۆماتۆئید ئارترۆز.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٠ تا٤٠ ملگم ڕۆژانە یەك جار.

بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، برینی ئەکتیڤی گەدەو ریخۆڵە، کێشەکانی خوێن بەربوون.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، هەستیاری بەرووناکی، خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرس، خوران.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لە تاری بینینو وزەوزی گوێ.

– لەماوەی بەکارهێنانی دەرمانەکە دەبێ ئاوێکی زۆر بخورێتەوە.

– دەست پێکی کاریگەری چارەسەرکردن لەوانەیە زیاتر لە مانگێك بخایەنێ.

– هێمایەکانی خوارەوە دەتوانیت هێمای ژارانگەزی گورچیلەیی بێت، گۆڕین لە شێوەی میزکردن، زیادکردنی کێشی لەش، ئاوسان، زیادبوونی ژانی جومگەکان، هەبوونی خوێن لە میزدا، تا.

## پرازوسین PRAZOSIN

● ناوی بازرگانی: Minipeso

● گرووپی دەرمانی: والا کەرەوەی دەمارەکان، دژی پاڵەپەستۆی خوێن.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١و٥ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: لە ماوەی چارە سەریدا شیردان دەبێ ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی خوێنی سووك، مامناوەند.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١تا٢ ملگم ڕۆژانە٢ تا٣ جار لە ڕۆژدا لانی زۆری ژەم٢٠ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: وشکی دەم، سەرسووڕان، لاوازی، ترپەی دڵ، دابەزینی پاڵە پەستۆی خوێن، گیرانی لووت، ژانی جومگە، تاری بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

- یەکەمین ژەمی دەرمان کاتی خەو بەکار بهێنرێت.
- خۆپاراستن لە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل تا ٤ کاتژمێر پاش یەکەمین ژەم.

## پردنیزۆلۆن PREDNIS OLON

● ناوی بازرگانی:
Delta _ Cortef
● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردن.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥، ٥٠ ملگم.
● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C (لە سێ مانگی یەکەمی سکپڕیدا گرووپی D)
● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دا هەڵسەنگێنرێت.
*بەکارهێنان: هەوکردن، نەخۆشیەکانی رۆماتیزم.
رێژەی بەکارهێنان: بەپێ ویستی پزیشكو لەژێر چاودێری پزیشك.
*بەکارنەهێنان: تووشبووان بە هەوکردنەکانی کەڕووی خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەناسە.
● زیانە لاوەکییەکان: بێ ئۆقرەیی، تووڕەبوون، بێ خەوی، زیبکە، زیادبونی ئارەزووی خواردن، برینەکانی کۆئەندامی هەرس، زیادکردنی شەکری خوێن، بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێن، پووکانەوەی ئێسك.
فێرکردنی نەخۆش:
- نابێ بەکارهێنانی دەرمان لەناکاو رابگیرێ.
- هێمایەکانی نارێکی ئادرنالتان لەبەر چاوبێت، تا لە کاتی سەرهەڵدانیان پزیشك ئاگادار بکەن Kهێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، شەکەتی لە رادەبەدەر، سەرسووڕان، تەنگە نەفەسی، لاوازیو ژانی جومگەکان.

## PROGESTRONE پرۆجسترۆن

- ناوی بازرگانی: Crinone
- گرووپی دەرمانی: هۆرمۆن
- شـێوەی دەرمـانی: ئەمپوولـەکانی ٢٥و٥٠ و فتیلەکانی ٢٠٠ و٤٠٠ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X .
- بـەکارهێنان لـە شـیردان: نـابێ بـەکار بهێنرێت.

*بـــەکارهێنان: چارەســـەری هۆرمـــۆنی لەکاتی لەزاکەوتن نەبونی خوێن بەربوونی مانگانە(بێ نوێژی) خوێن بەربوونی بـەبێ هۆی مندالآن.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥تا١٠ ملگم بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ.

*بــەکار نــەهێنان: نەخۆشـــی جگـــەر، شـێرپەنجەی مـەمك، خـوێن بـەربوونی دیاری نەکراو، سکپڕی، شیردان.

زیانـــە لاوەکییـــەکان: سەرســـووڕان، سەرئێشە، خەمۆکی، زیبکـە، نـەمانی بـێ نوێـژی، مـەیین لـەدەماری سـییەکان، بەرزبوونەوەی شـەکری خـوێن، کـەمبونی ئارەزووی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشك لـە گرێـی مـەمك. خــوێن بــەربوونی واژینـــال، ئاوســـان. زەردەی، پاشەڕۆی کەم ڕەنگ، میزی پـڕ ڕەنـــگ، بـــێ هەســـتیو ڕەقبـــوونی ماسوولکەکان.

## PROMETAZINE پرۆمتازین

- ناوی بازرگانی: Phenergan
- گرووپی دەرمانی: هێمن کەرەوە، دژی هەستیاری.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥ ملگم، ئەمپوولەکانی ٢٥ ملگم، شەربەتی ٥ ملگم لە هەر ٥ سی سی.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپیC .
- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـەکارهێنان: هێڵـنج، هـێمن کـەرەوە، نەخۆشی سەفەر.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٥تـا ٥٠ ملگم کـاتی خـەو.

*بەکارنەهێنان: پەرکەم، تەنگی نەفەسی.

● زیانە لاوەکییەکان: زیانەکانی خوێن، گرژی، سەرئێشە، بێ ئۆقرەیی، وشکی دەم، هێڵنجو رشانەوە، میزگیران.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگاداركردنی پزیشك لەکاتی خەواڵوویی، دابەزینی پاڵە پەستۆی خوێن.

– جوڵەی نائیرادی، تا، قورگ ئێشە بەپزیشك رابگەینرێت.

پروپرا نۆلۆل: propanolol

● ناوی بازرگانی: Indral

● گرووپی دەرمانی: دژی پاڵەپەستۆی خوێن، دژی مێگەرین.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٤٠،٢٠،١٠،٨٠ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C (لەسێ مانگی دووەمو سێیەم گرووپی d).

● بەکارهێنان لەشیردان: لە ماوەی بەکارهێنانی دەرمان باشتروایە شیردان رابگیرێت.

*بەکارهێنان: پاڵەپەستۆی خوێن، نارێکی لەلێدانی دڵ، پێشگرتن لەسەرئێشەکانی دەمار، چارەسەری یارمەتیدەری پەشێوی.

رێژەی بەکارهێنان: بە پێ ی ویستی پزیشك٢٠ تا٨٠ ملگم لەرۆژدا.

*بەکارنەهێنان: نارێکی دڵ، تەنگە نەفەسی، شۆکی دڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: شەکەتی، کەمبونی پاڵەپەستۆی خوێن، هێڵنج، کەمونی ئارەزووی سێکسی، زیانەکانی پێست، کەمبونی ژمارەی ترپەکانی دڵ، ژانی جومگە.

فێرکردنی نەخۆش:– نابێ بەکارهێنانی دەرمان لەناکاو رابگیرێ.

– لە بەسەلاچووان بەوریایی بەکاربهێنرێت.

دەرمانەکە لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

## پروپیل تیوراسیل propyl thiouracil

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی پرکـــاری تیروئیـد.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠ ملگم

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپـی b .

● بەکارهێنان لەشیردان: بەکارنەهێنرێت.

*بـــەکارهێنان: چارەســـەری پرکـــاری تیروئید،گواتری ژەهراوی.

ڕێژەی بەکارهێنان: بە ١٠٠ ملگم ڕۆژانە٣ جاردەســت پێبکرێتوپاشــان ١٠٠ ملگــم ڕۆژانە١ تا ٣ جار.

*بەکارنەهێنان: شیردان.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، رشانەوە، کــەمبونی ژمــارەی خانــەکانی خــوێن، زەردی، سەرئێشـــە، خـــەمۆکی، ژانـــی جومگەو لەش.

● فێرکردنـی نـەخۆش:

– ئاگـــادارکردنی پزیشـــك لەئاوســـان، ســـووربون، قـــوڕگ ئێشـــە، زیانـــەکانی دەرمانەکە.

– نـــابێ بـــەکارهێنانی دەرمـــان لـــە ناکاوڕابگیرێ

– هێمایەکانی بەکارهێنانی ژەمـی بـەرزی دەرمان بریتین لـە، ئاوسـانی دەوروبـەری چـاو. بەرگەنـــەگرتنی ســـەرما، گـــەرما، خەمۆکی.

– هێمایـــەکانی پێشـــاندەری کـــەم بەکارهێنانی دەرمان بریتین لەترپەی دڵ، سکچوون، تا.

## پیرو ینیوم پاموئات pyrvinium pamoate

● ناوی بازرگانی: Vanquin

● گرووپی دەرمانی: دژی کرم.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠ ملگمو شـەربەتی ٥٠ ملگـم لـە ٥ سـی سـی.

*بەکارهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی c .

● بـەکارهێنان لـە شـیردان: سـوودەکانی دەرمـــان لـــە بەرامبەرزیانـــەکانی هەڵســـــــــــەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: ئالودەی بوون بەکرموك.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ ملگم بۆ هەر کیلۆگم کێشی لەش و دووبارەکردنەوەی ٢تا٣ هەفتە پاش.

*بەکارنەهێنان: ناهاوسەنگی لە کارکردی جگەرو گورچیلەو نەخۆشیەکانی هەوکردنی ڕیخۆڵە.

● زیانە لاوەکییەکان: هەستیاری بەرووناکی، ژانی سك، هێڵنج، ڕشانەوە، سەرسووڕان.

*فێرکردنی نەخۆش:

– لەوانەیە ڕەنگی پاشەڕۆ سووربێت کەبایەخێکی نیە.

– لەوانەیە ڕشانەوەش سووربێت.

# R

## ranitidine رانیتیدین

● ناوی بازرگانی: Zantac

● گرووپی دەرمانی: مەهارکەری ترشەلۆکی گەدە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٥٠ ملگم و ئەمپوولەکانی ٥٠گمی. شەربەت ٧٥ ملگم لە٥ سی سی.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی b .

● بەکارهێنان لەشیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: برینی گەدەو دوازدەگرێ، گەڕانەوەی ترشەلۆکی گەدە بۆسورێنچك، سووتانەوەی سەرەوەی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان: ڕۆژانە یەك حەب هەر١٢ کاتژمێر یان ٢ حەب بەرلەنووستن.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانە لاوەکییەکان: لاوازی، سەرئێشە، سەرســــووڕان، سکچـــــوون، ژانـــــی ماسوولکەیی، قـەبزی، کـەمبونی ژمـارەی خانەکانی خوێن ، خوران.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەوانەیە ببێتە هۆی گـەورەبونی مـەمك لە پیاوان یان ناتوانایی سێکسی( لـەکاتی بەکارهێنانی درێژخایەن).

– خۆپاراستن لـە بـەکارهێنانی ئـەلکهول، بیبەر بەهارات.

– خۆپاراستن لەبەکارهێنانی جگەرە.

**رپاگلینید repaglinide**

● ناوی بازرگانی: Novonorm

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی نەخۆشـــی شەکرە.

● شێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ٥ /١و٢ ملگم.

● بەکارهێنان لەسکپڕیدا: گرووپی C .

بەکارهێنان لە شیردان: بەکارنەهێنرێت.

*بەکارهێنان: نەخۆشی شەکرە.

*ڕێژەی بـەکارهێنان: ١تـا٢ ملگم لەگـەڵ هەر ژەمی خواردن.

*بەکارنەهێنان: لەکاتی نەخۆشی شەکری خوێنی زیاندار.

● زیانـە لاوەکییـەکان: سەرئێشـە، ژانـی قەفەســەی ســنگ، هێڵـنج، بەدهــەرس کردن.

فێرکردنی نەخۆش:

– لــە بەکارنــەهێنانی لــەناکاو خۆتــان بپـارێزن.

– تـا ٤ رۆژ ئـەم دەرمانـە بـەر لـەخواردن بەکاربهێنرێت.

**ریفامپین rifampin**

● نـــــــــاوی بازرگـــــــــانی: Rimacatanc

● گرووپی دەرمانی: دژی سیل.

● شـێوەی دەرمـانی: کەپســوولەکانی ١٥٠و٣٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بــەکارهێنان لــە شــیردان: لــەماوەی چارەسەریدا شیردان ڕابگیرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری سیلی سیەکان، خورە(پیسی)، هەوکردنی ئێسك، هەوکردنی پەردەکانی دەماغ.
ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش یەك جار لە ڕۆژدا.
*بەکارنەهێنان: نارێکی جگەر، تاکەکانی ئەلکهول خۆر.
● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، شەکەتی، بایسك، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، کەمبوونی خانەکانی خوێن، ناهاوسەنگی لە بینین، زەردی، هێماکانی وەکو ئەنفلۆنزا.
فێرکردنی نەخۆش:
– ئەم دەرمانە دەبێتە هۆی گۆڕینی ڕەنگی میز، پاشەڕۆ، خلّت، تەنانەت گۆڕینی ڕەنگی فرمێسك.
– بەکارنەهێنان یا درێژە بەکارهێنان پاش بەکارنەهێنان پەشێوی خۆدسەرانە قەدەغەیە.
– ئاگادارکردنی پزیشك لەو کاتەی کەلە دەرمانی دژی مەیین سوود وەردەگرن.



salbutamol سالبوتامول

● ناوی بازرگانی: Ventolin
● گرووپی دەرمانی: والآکەری برونش.
● شێوەی دەرمانی: حەب، شەربەت، سپرا، تەزریقی.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.
*بەکارهێنان: بۆ چارەسەری تەنگەنەفەسی، هەوکردنی سییەکان، تەسك بوونەوەی ڕێڕەوی هەناسە.
ڕێژەی بەکارهێنان: لە کاتی پەلامار هەر ٢٠ خولەك ٤ پاف. لە دۆخەکانی درێژخایەن ٢ پاف هەر ٦ کاتژمێر.
*بەکارنەهێنان: نارێکی لێدانی دڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، لەرزینی دەست، بێ ئۆقرەیی، وشکی دەم، بێ خەوی، ترپەی دڵ، زیادبوونی ترپەی دڵ، ڕشانەوە، گرفت لە میزکردن، سووتانەوەی سەرەوەی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

– گریمانەی سەرسووڕان و گێژی لە ئارادایە.

– لەرزینی دەست لەکاتی سوودوەرگرتنی درێژخایەن باوە.

**سالمترول salmetrol**

● ناوی بازرگانی: Serevent

● گرووپی دەمانی: والاکردنی برونش.

● شێوەی دەرمانی: سپڕا.

● بەکاهێنانی لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری ڕاگری تەنگەنەفەسی، ڕێگرتن لە تەنگەنەفەسی بەدی هاتوو لە وەرزش.

ڕێژەی بەکارهێنان: هەستیاری یەکجار زۆر.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، لەرزین. تووڕەبوون، ترپەی دڵ، کۆکە، سکچوون.

*پارێزگارییەکان: ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، بەرزبوونی پاڵەپەستۆی خوێن. گرژی.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەکاتی گەڕانەوەی نەخۆش بەکارنەهێنرێت.

**سرترالین sertralin**

● ناوی بازرگانی: Zoloft _ Asentra

● گرووپی دەرمانی: دژی خەمۆکی.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ۲۵، ۵۰و۱۰۰ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.

● بەکارهێنان لە شیردان: تەنیا بە وریایی بەکاربهێنرێت.

*بەکارهێنان: خەمۆکی، وەسواس.

ڕێژەی بەکارهێنان: لە پێگەیشتووان ۵۰ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: بەکارهێنانی هاوکاتی ترانیل سیپرومین.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، سەرسووڕان، تووڕەبوون، بێ خەوی، هێڵنج، ژانی سك، وشکی دەم، خوران، ژانی قەفەسەی سینگ، زیادبوونی ئانزیمەکانی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

– لەوانەیە دەستپێکی کاریگەری چارەسەری یەك هەفتە یان زیاتر بخایەنێ.

– ئەو کاتەی کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن سوود لەم دەرمانە وەردەگیرێ نابێ بەکارهێنانی لەناکاو ڕابگیرێ.

– خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

سیلدنافیل sildenafil

● ناوی بازرگانی: Viagra

● گرووپی دەرمانی: چارەسەری ناتوانایی سێکسی.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢٥، ٥٠و ١٠٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: توێژینەوەی لەسەر نەکراوە.

● بەکارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەکابهێنرێت.

*بەکارهێنان: ناهاوسەنگی لە ڕەپ بوون، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ ملگم یەك کاتژمێر بەر لە جووتبوون(لە تاکەکانی بەتەمەن بە ٢٥ ملگم دەست پێ بکرێت).

*بەکارنەهێنان: بەکارهێنانی نیتراتەکانی ئارگانیك.

● زیانە لاوەکییەکان: مەرگی لەناکاو، وەستانی دڵ، ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، ناهاوسەنگی بینین، ترس لە ڕووناکی،

وزەوزی گوێ، خوران، سکچوون، ژانی جومگە، تەنگە نەفەسی.

*پارێزگاریەکان: وەستانی دڵ لەم دواییەدا، نارێکی دڵ، نەخۆشی دەمارەکانی دڵ، برینی گەدە، ناهاوسەنگی جگەر یان گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە ئێوە لە بەرامبەر نەخۆشیەکانی راگوێزراو لە رێگەی سێکسی ناپارێزێت.

– هەڵمژینی دەرمان لەگەڵ خواردنی چەوردا کەم دەبێت.

– ئەم دەرمانە نابێ لەگەڵ نیتروگلیسرین بەکاربهێنرێت.

– دەکرێ حەبەکان نیوە بکرێن.

## سیلور سولفادیازین
## silver sulfadiazine

- ناوی بازرگانی: Silvadene
- گرووپی دەرمانی: دژی بەکتریا، دژی هەوکردن.
- شێوەی دەرمانی: کرێم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی b.
- بەکارهێنان لە شیردان: تا چەند رۆژ پاش بەکارهێنان شیردان رابگیرێ.

*بەکارهێنان: سووتان و چارەسەری هەوکردنەکانی پێست.

رێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢جار رۆژانە بەئەستووری ١.٥ میلی متر لە سەر برینەکە بماڵدرێت.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری توند، سکپڕی، ساوایان.

- زیانە لاوەکییەکان: خوران، هەستیاری، کەم خوێنی.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئەم دەرمانە نابێتە هۆی رەنگی بوونی جلو بەرگ.

– ئاگـــاداركردنی پزیشـــك لــــەكاتی سەرهەڵدانی زیانەكانی لاوەكییەكان.

## سۆربیتۆل sorbitol

- ناوی بازرگانی: Sorbilax
- گرووپی دەرمانی: دژی قەبزی.
- شێوەی دەرمانی: تۆز.
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی c.
- بەكارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەكارهێنان: بۆ چارەسەری قەبزی.

ڕێـژەی بـەكارهێنان: ٥ تـا ١٠گـم هـەر ٦ كاتژمێر یان ١٢٠ ملگم بەشـێوەی انما لـە ڕێگەی كۆم.

*بەكارنەهێنان: لە تاكەكانی تووشبوو بە بەرگە نەگرتنی گلوكز.

- زیانــە لاوەكییــەكان: سكچــوونو دڵ ئێشە، بای سك، وێك هاتنەوەی سك.

## ئسپیرۆنۆلاكتۆن spironolactone

- ناوی بازرگانی: Aldactone
- گرووپـی دەرمـانی: دژی پاڵەپەسـتۆی خـوێن ـ میـدر(دەرمـان یـان هـەر شـتێكی خواردن كەببێتە هۆی زیادبوونی میز).
- شێوەی دەرمانی: حەبـەكانی ٢٥و ١٠٠ ملگم.
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی d.
- بــەكارهێنان لـــە شـــیردان: لـــەكاتی چارەسەریدا دەبێ شیردان ڕابگیرێ.

*بـــەكارهێنان: پاڵەپەســـتۆی بـــەرز، ئاوسـانی ئەندامـەكانو لـەش، كـەمبوونی پۆتاسیۆم بـەدی هـاتوو لـە دەرمانـەكانی میدر.

*بەكارنـــەهێنان: نـــاڕێكی گورچـــیلە، نــەبوونی میــزو بــەرزبوونی پۆتاســیۆمی خوێن.

- زیانــە لاوەكییــەكان: لێـر، كـەمبوونی ئـــارەزووی خـــواردن، بەرزبوونـــەوەی پۆتاسیۆمی خوێن.

فێركردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی خواردەمەنی هەلگری پۆتاسیۆمی بەرز وەکو پرتەقاڵ ـ مۆز ـ میوەکانی وشکراوو خورما.
- لەوانەیە بەکارهێنانی ئەم دەرمانە ببێتە هۆی خەواڵوویی.
- ئاگاداركردنی پزیشك لەكاتی ئەستووربوونی دەنگ لە ئافرەتانداو گەورەبوونی مەمك لە پیاوانو سەرئێشە.

**ئستریپتومایسین STREPTOMYCINE**

- ناوی بازرگانی: Strepool
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بایوتیك.
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوول(ڤیال) ١گمی.
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی D.
- بەكارهێنان لە شیردان: باشترە شیردان ڕابگیرێ.

*بەكارهێنان: چارەسەری سیل.

ڕێژەی بەكارهێنان: ١.٥ ملگم بۆ هەر كیلۆگم كێشی لەش.

*بەكارنەهێنان: بڕوانە جنتامایسین.

- زیانە لاوەكییەكان: زیانەكانی گورچیلە، كەمبوونی بیستن، هێڵنج،سەرسووڕان، هەستیاری پێستی.

فێركردنی نەخۆش:

- ئاگاداركردنی پزیشك لە سەرئێشە، سەرسووڕان، كەمبوونی ڕێژەی بیستن.
- بەكارهێنانی شلەمەنی لە ماوەی بەكارهێنانی دەرمان.

**سولفاستامید sulfacetamid**

- ناوی بازرگانی: Ak _ Sulf
- گرووپی دەرمانی: ئەنتی بیوتیك.
- شێوەی دەرمانی: دڵۆپ ١٠و ٢٠ لە سەدا.
- بەكارهێنان لە سكپڕیدا: گرووپی C.
- بەكارهێنان لە شیردان: بە وریایی بەكاربهێنرێت.
- بەكارهێنان: هەوكردنی چاو.

ڕێژەی بەكارهێنان: ١ تا ٢ دڵۆپ هەر ٤ تا ٦ كاتژمێر.

*بەكارنەهێنان: هەستیاری توندی دەرمانی، هەوكردنی كەڕوویی چاو،

هەوکردنەکانی ڤایرۆسی وەکو خۆریکەی مریشکان‌و تامیسکە.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، ئاوسان، هەستیاری.

فێرکردنی نەخۆش:

– ئاگادارکردنی پزیشک لە زیانەکانی لاوەکییەکان.

سولفاسالازین sulfasalazin

● ناوی بازرگانی: Ucine

● گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی ڕیخۆڵە، برینی ڕیخۆڵە ئەستورە.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠٠ ملگم‌و انمای ٣٠ ملگم لە هەر سی سی دا.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: ڕۆماتیزمی جومگە، نەخۆشی ڕۆماتیزم وەکو ئسکلرودرمی، ئسپوندبلیت.

*بەکارنەهێنان: گیرانی ڕیخۆڵە، میزگیران، ناهاوسەنگی توندی جگەرو گورچیلە، هەستیاری بە سالیسیلاتەکان.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ژانەسک، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، سەرئێشە، هەستیاری بە رووناکی، گۆڕینی ڕەنگی میز، هەڵوەرینی موو.

فێرکردنی نەخۆش:

– دەرمان بە پەرداغێکی ئاو بەکاربهێنرێت.

– ئەسید فولیك بە نەخۆش بدرێت.

– خۆپاراستن لە هەڵکەوتن لەبەر تیشکی خۆر.

– ئاگادارکردنی پزیشك لەکاتی قورگ ئێشە، تا، شین هەڵگەڕان‌و خوێن بەربوونی ناسروشتی.

سوماتریپتان sumatriptan

● گرووپی دەرمانی: دژی لاژانە سەر(میگەرین).

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥٠و ١٠٠ ملگم‌و ئەمپوولەکانی ١٢٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـــــــەکارهێنان: چارەســــــەری لاژانەسەر(میگەرین).
ڕێژەی بەکارهێنان: بەر لە دەستپێکی سەرئێشە لێدانی ئەمپوول بەشێوەی ژێرپێستی.
*بەکارنەهێنان: پاڵەپەستۆی خوێنی کۆنترۆڵ نەکراو، نەخۆشی دەمارەکانی دەماغ.
● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، ڕشانەوە، گۆڕین لە هەستکردن بە تامی دەم، پەشێوی.
*پارێزگاریەکان: ناهاوسەنگی لە لێدانی ترپەکانی دڵ، پێشینەی وەستانی دەماغ، بەرزبوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ.
فێرکردنی نەخۆش:
– ئاگادارکردنی پزیشك لە ژانی قەفەسەی سینگ، هەستکردن بە سینگ گیران، ژانەکانی سك.
– پاش خواردنی دەرمان لە شوێنێکی تاریو بێ دەنگ پشوو بدەن.



TADALAFIL تادالافیل

● ناوی بازرگانی: Cialis
● گرووپی دەرمانی: بۆ چارەسەری ناهاوسەنگی لە کارکردنی ڕەپ بوون.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١٠و ٢٠ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕی: گرووپی B.
● بەکارهێنان لە شیردان: توێژینەوەی لەسەر نەکراوە.
*بەکارهێنان: ناهاوسەنگی لە کارکردنی ڕەپ بوون.
ڕێژەی بەکارهێنان: ١٠ تا ٢٠ ملگم نیو تا یەك کاتژمێر بەر لە جووتبوون.
*بەکارنەهێنان: ئەو نەخۆشانەی کە لە ژێر چارەسەری بە نیترۆگلیسرین یان پرازوسین دان، ناهاوسەنگی یەکانی

جگەر، تا ٩٠ ڕۆژ پاش وەستانی دڵ، پاڵەپەستۆی خوێنی کۆنترۆڵ نەکراو، پاڵەپەستۆی نزمتر لە ٩٠\٥٠ ، سەکتەی دەماغ لەماوەی ٦ مانگی ڕابردوو.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، گرگرتن، گیرانی لووت، بەدەمەرسکردن، ژانە پشت، ژانی ئەندامەکان.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئەم دەرمانە لە ڕێگرتن لە نەخۆشی ڕاگوێزراو لە ڕێگەی سێکسی کاریگەری نیە.

- ئەم دەرمانە کارییەکی لە بزواندنی ئارەزووی سێکسی نیە.

- ئاگادارکردنی پزیشک لەو کاتەی کە ڕەپ بوون زیاتر لە ٤ کاتژمێر درێژەی هەبێت.

## تامسولوسین TAMSULOSIN

● ناوی بازرگانی: omnic،Flomax

● گرووپی دەرمانی: بلوك کەری وەرگری ئالفا.

● شێوە: حەبەکانی ٠.٤ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.

*بەکارهێنان: چارەسەری گەورەیی پرۆستات.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب ڕۆژی یەك جار.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانە لاوەکییەکان: سەرئێشە، بێ خەوی، ژانی قەفەسەی سینگ، هاتنەخوارەوەی ئاو لە لووت، سینوزیت، سکچوون، هێڵنج، سووربوون، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- ٤ کاتژمێر پاش بەکارهێنانی یەکەمین ژەم یا زیادکردنی ڕێژەی ژەمەکە، لەلێخوڕینی ئۆتۆمۆبێل خۆتان بپارێزن.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

**تستوسترون TESTO STERONE**

- ناوی بازرگانی: Andriol
- گرووپی دەرمانی: هۆرمۆنی ئاندرۆژن.
- شێوەی دەرمانی: کەپسوول و ئەمپوول.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D.
- بەکارهێنان لە شیردان: قەدەغەیە.

*بەکارهێنان: کەمبوونی هۆرمۆنی سێکسی پیاوانە، چارەسەری شێرپەنجەی مەمك لە ئافرەتاندا، چارەسەری کەم خوێنی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٤٠٠ تا ٥٠٠ ملگم هەر ٢ تا ٤ هەفتە.

*بەکارنەهێنان: شێرپەنجەی پرۆستات، شێرپەنجەی مەمك لە پیاوان، گەورەیی پرۆستات، نەخۆشی توندی گورچیلەو دڵ.

- زیانە لاوەکییەکان: پرمویی لە ئافرەتاندا، بۆربوونی دەنگ لە ئافرەتاندا، زیپکەکانی گەورە لە دەم و چاو، کەمبوونی ئارەزووی سێکسی.

فێرکردنی نەخۆش:

- کاتی بەکارهێنانی دەرمان ڕژێمی خواردەمەنی کالری و پرۆتین دار ڕادەسپێرێت.
- نابێ بەکارهێنانی دەرمان لەناکاو ڕابگیرێ.
- لەکاتی سەرهەڵدانی هەڵئاوسانی دەست و پێ پزیشك ئاگاداربکرێت.

**تتراکائین TETRACAINE**

- گرووپی دەرمانی: بێ هەست کەر.
- شێوەی دەرمانی: دڵۆپەکانی چاو.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: بێ هەست کەری کورت خایەن بۆ پشکنینی چاو پزیشکی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ دڵۆپ.

*بەکارنەهێنان: هەوکردن یان هەڵئاوسانی چاو.

● زیانە لاوەکییەکان: لێڵی گلێنـە، تـاری دیتن، هەوکردنی گلێنە.

فێرکردنی نەخۆش:

- دەرمـان دەبـێ لـەناو کیسـەی پێلـۆوی خـوارەوە بکرێـتو بەشـێوەی ڕاسـتەوخۆ لەسەر گلێنە نەکرێت.

- لە گیراوەی لێڵ نابێ سوود وەربگیرێ.

- بـۆ بـەکارهێنانی نـەخۆش لـە ماڵـەوە ڕاناسپێردرێت.

## تتراسایکلین TETRACYCLINE

● ناوی بازرگانی: Tetracyn

● گرووپی دەرمانی: ئەنتی بایوتیك.

● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ٢٥٠ ملگم، مەرهەمی چاوو پێست.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D.

● بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بـەکارهێنان: هەوکردنـەکانی سـووك تـا مام ناوەند.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: یەکـە تـا ٢ دەنـك ٤ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری بـــەخۆی، منداڵانی تەمەن کەمتر لە ٨ساڵ.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچـوون، سەرسـووڕان، هەسـتیاری بـە ڕوونـاکی، درماتیت توند.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە هەڵکەوتن لەبـەر تیشـکی خۆر.

- تا ٢ کاتژمێر پاش بەکارهێنانی دەرمـان لـە بەرهـەمی شـیرەمەنیو ئـەنتی ئەسـید سوود وەرنەگیرێ.

- لـەو کاتـەی کـە تتراسـایکلینی مـاوە بەسەرچوو بەکاربهێنرێـت دەتـوانی ببێتـە هۆی زیانەکانی گورچیلە.

- بایـەخ بـە سکچـوون بـدرێتو پزیشـك ئاگاداربکرێت.

## THEOPHYLIN تیۆفیلین

● ناوی بازرگانی: Bronkodyl

● گرووپـــی دەرمـــانی: والاکـــەرەوەی برونش، دژی تەنگەنەفەسی.

● شێوەی دەرمانی: حەب، کەپسوول.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لـە شـیردان: دەچـێتە نـاو شـیرو دەتوانێـت ببێتـە هـۆی بزوانـدنی شیرخۆر.

*بـــەکارهێنان: تەنگـــە نەفەســـی درێژخایەن، برونشیت.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: ١ تـا ٢ حـەب ٢٠٠ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنـــەهێنان: هەســـتیاری بـــەخۆی، برینی کۆئەندامی هەرس، گرژی.

● زیانە لاوەکییەکان: هێڵنجو ڕشـانەوە، گرژی، سکچوون، میزگیران، ناهاوسـەنگی لە لێدانی دڵ.

*پارێزگاریـەکان: بەسالاچـوان، نـارێکی جگەرو گورچیلە، پەستانی خـوێنی بـەرز، وەستانی دڵ، نەخۆشی شەکرە.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشـــترە هـــاوڕێ لەگـــەڵ خـــواردن بەکاربهێنرێت.

- نابێ حەبەکان ورد بکرێن.

- هێماکـــانی خـــوارەوە پێشـــاندەری ژارانگەزینو دەبێ پزیشـك ئاگاداربکرێـت: هێڵنج، ڕشـانەوە، پەشـێوی، بێ خـەوی، گرژی.

## TIMOLOL تیمولول

● ناوی بازرگانی: Timoptic

● گرووپی دەرمانی: مەهارکەری وەرگری بتا.

● شێوەی دەرمانی: دڵۆپی چاو.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بـەکارهێنان لـە شـیردان: لـە مـاوەی چارەسەری دا شیردان دەبێ ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: بۆ پاڵەپەستۆی چاو.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ دڵۆپی چاو.

*بەکارنەهێنان: تەنگەنەفەسی، نەخۆشی سییەکان.

● زیانـــــە لاوەکییـــــەکان: هێڵـــــنج، سەرســـووڕان، شـــەکەتی، نـــارێکی دڵ، تەنگەنەفەسـی، ناهاوسـەنگی لـە لێدانی دڵ.

| تولترودین | TOLTERODINE |
|---|---|

● ناوی بازرگانی: Detrol

● گرووپـــی دەرمـــانی: دژی وەرگـــری موسکارینی.

● شـێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ١و ٢ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

*بـەکارهێنان لـە شـیردان: بـەکارهێنانی قەدەغەیە.

*بـەکارهێنان: میزڵـدانی لـە راددەبـەدەر ئەکتیڤ(میزکردن، ئارەزووی دەسـت بـە جـێ بـۆ میزکـردن، بـێ ئیختیـاری لـە میزکردن).

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ ملگم ٢ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: زیـادبوونی پاڵەپەسـتۆی ناو چاو، میزگیران، گـیران لـە کۆئەنـدامی هەرس.

● زیانـــــە لاوەکییـــــەکان: پەشـــێوی، شـــەکەتی، سەرســـووڕان، ناهاوســـەنگی یـەکانی یادگـە، بەرزبوونـەوەی پەسـتانی خـوێن، قـەبزی، وشـکی دەم، میـزگیران، خوران.

*پارێزگاریەکان: نەخۆشەکانی گورچیلەو جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

- لەوانەیـــە دەرمانەکـــە ببێتـــە هـــۆی سەرسووڕان بۆیە نـابێ چالاکییەکانی کـە پێویسـتیان بـە وشـیاری هەیـە ئـەنجام بدرێن.

- خۆپاراســـتن لـــە خواردنـــەوەی شلەمەنییەکان بەر لە نووستن.

## ترامادول TRAMADOL

- ناوی بازرگانی: Ultram
- گرووپی دەرمانی: دژی ژان.
- شێوەی دەرمانی: حەبو کەپسوولو ئەمپوول.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: ژانی مام ناوەند، توند.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥٠ تا ١٠٠ ملگم خۆراکی یان تەزریقی هەر ٤ تا ٦ کاتژمێر.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، ژارانگەزی بە ئەلکهول.

- زیانە لاوەکییەکان: سەرسووڕان، سەرئێشە، خەواڵوویی، تووڕەبوون، قەبزی، هێڵنج، ڕشانەوە، میزگیران، ناهاوسەنگی بینین.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

## تریامسینولون TRIAMCINOLONE

- ناوی بازرگانی: Kenacort
- گرووپی دەرمانی: دژی هەوکردنی کورتون.
- شێوەی دەرمانی: ئەمپوولو مەرحەم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی توند.

ڕێژەی بەکارهێنان: بەپێی ویستی پزیشك جیاوازە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، هەوکردنی کەڕوویی.

- زیانە لاوەکییەکان: زیپکە، چاك نەبوونەوەی برینەکان، ڕەش هەڵگەڕانی پێست، خەمۆکی، سەرئێشە، بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، پووکانەوەی ئێسك، سکچوون، هێڵنج، خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرس، زیادبوونی ئارەزووی خواردن، تاری

بینین، زیادبوونی مەترسی تووشبوون بە هەوکردنەکانی کەڕوویی.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئاگادارکردنی پزیشک لە هێماکانی نارێکی ئادرنال (هێڵنج، کەمبوونی ئارەزووی خواردن، شەکەتی لە رادەبەدەر، سەرسووڕان، تەنگە نەفەسی، لاوازیو ژانی جومگەکان.

**تریامترن - اچ TRIAMTERENE H**

- ناوی بازرگانی: Dyazide
- گرووپی دەرمانی: میزهێنەر.
- شێوەی دەرمانی: حەب.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.
- بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دا هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: پەستانی خوێن، ئاوسان بەهۆی نارێکی دڵ.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢٥٠ ملگم تا سێ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، میزنەهاتن، نارێکی توندی گورچیلەو جگەر.

- زیانە لاوەکییەکان: دابەزینی پەستانی خوێن، وشکی دەم، کەم خوێنی سەرسووڕان، زیانی پێست، بەردی گورچیلە.

*پارێزگارییەکان: تاکەکانی بەتەمەن، نەخۆشی شەکرە، ناهاوسەنگی لە کارکردنی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشتر وایە دەرمان لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی خواردەمەنییەکانی هەڵگری پۆتاسیۆمی بەرز وەکو پرتەقاڵ - مۆز، مێوەکانی وشك كراو - خورما.

## تری فلوپرازین TRIFLUOPERAZINE

● گرووپی دەرمانی: دژی ڕشانەوە، دژی شێتایەتی.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ١، ٢و ٥و١٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

● بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دا هەڵسەنگێنرێت.

*بەکارهێنان: چارەسەری ناهاوسەنگییەکانی دەروونی، پەشێوی، نەخۆشی ئسکیزوفرنی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ ملگم خۆراکی ٢ جار لە ڕۆژدا.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، کۆما، زیانەکانی دەماغ، ناهاوسەنگی یەکانی مەیین.

● زیانە لاوەکییەکان: ناهاوسەنگی لە لێدانی دڵ، هێڵنج، قەبزی، وشکی دەم، مێزگیران، ناهاوسەنگی لە تۆوفڕێدان، زیادکردنی کێش، هەستیاری بە ڕووناکی.

*پارێزگارییەکان: نەخۆشی دڵ، مێزگیران، گەورەیی پرۆستات، ناهاوسەنگی جگەرو گورچیلە.

فێرکردنی نەخۆش:

- پاش لێدانی دەرزی بەشێوەی ماسوولکەیی تا نیو کاتژمێر خۆتان درێژبکەن.

- خۆپاراستن لە خۆشوشتن بە ئاوی گەرم بەهۆی دابەزینی پەستانی خوێن.

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.

- لەدژەخۆر سوود وەربگیرێ.

## تری هگزی فنیدیل TRIHEXYPHENIDYL

● ناوی بازرگانی: Artan

● گرووپی دەرمانی: دژی پارکینسون.

● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕی: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: پارکینسون.

ڕێـژەی بـەکارهێنان: بـە ژەمـی ١ ملگـم دەست پێ بکرێتو ٣ تا ٥ ڕۆژ پاش بـۆ ٢ ملگم ڕۆژانە زیادبکرێت. لانی زۆری ژەمـی دەرمان ٦ تا ١٠ ملگمە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: تووڕەبـــوون، سەرسـووڕان، دوودڵـی، سەرئێشـە، تـاری بینین، وشکی دەم، قەبزی، میزگیران.

*پارێزگارییـەکان: گـەورەیی پرۆسـتات، گیرانــی کۆئەنــدامی هــەرس، پەســتانی خـوێنی بـەرز، نەخۆشــی دڵ، نەخۆشــی جگەر.

فێرکردنی نەخۆش:

- نـابێ بــەکارهێنانی دەرمــان لــەناکاو ڕابگیرێ.

- بــەهۆی بــەدی هــاتنی خــەواڵوویی لــە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستیان بە وشیاری هەیە، خۆتان بپارێزن.

- خۆپاراستن لە وەستان لە هـەوای گـەرم بۆ ڕێگرتن لە گەرماگەزی.

## TRIPLE SULFA تریپل سولفا

● گرووپـی دەرمـانی: ئـەنتی بایوتیـک ـ واژینال.

● شێوەی دەرمانی: حەبی واژینال.

*بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: ڕاناسپێردرێت.

*بەکارهێنان: هەوکردنی واژینال.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ جار بۆ ماوەی ٤ تا ٦ هەفتە.

*بەکارنەهێنان: نارێکی توندی گورچیلەو جگەر، هەستیاری بەخۆی، لوپوس.

● زیانـــە لاوەکییـــەکان: ســـووتانەوە، سووربوون.

فێرکردنی نەخۆش:

- ماوەی دەرمانەکە تەواو بکرێت.

- پاش بەکارهێنانی کرێمـی واژینـال لانـی کەم نیوکاتژمێر دەبێ خۆتان درێژ بکەن.

U

## یورسوودزۆکسی کولیك ئەسید
## URSODEZOXYCHOLIC ACID

● ناوی بازرگانی: Ursodiol
● گرووپی دەرمانی: ترشەلۆکی زەرداو.
● شێوەی دەرمانی: کەپسوولەکانی ۲۵۰و۳۰۰ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی B.
بەکارهێنان لە شیردان: بەوریایی بەکاربهێنرێت.
*بەکارهێنان: تاواندنەوەی بەردەکانی زەرداو.
ڕێژەی بەکارهێنان: ۱۰ تا ۱۵ ملگم بۆ هەرکیلۆگم کێشی لەش.
*بەکارنەهێنانو پارێزگارییەکان: هەستیاری بەخۆی، نەخۆشی درێژخایەنی جگەر، گیرانی ڕێڕەوی زەرداو، نەخۆشی هەوکردنی ڕیخۆڵە.
● زیانە لاوەکییەکان: خوران، لێی وشکی، سەرئێشە، خەمۆکی، قەبزی ژانی جومگەکان.
*فێرکردنی نەخۆش:
- پەشێوی، خەمۆکی، بێ خەوی بەدی هاتوو لە بەکارهێنانی دەرمان پاش بەکارنەهێنانی دەرمان لەناو دەچن.
- نابێ هاوڕێ لەگەڵ دەرمان لە ئەنتی ئەسیدی هەلگری ئەلمینیۆم سوو وەربگیرێ.
۳ـ لەکاتی فەرامۆشی دەست بە جێ پاش بەبیرهاتنەوە دەرمانەکە بەکاربهێنرێت.



والپۆرات سۆدیۆم

VALPORATE SODIUM

- ناوی بازرگانی: Orlept
- گرووپی دەرمانی: دژی گرژی.
- شێوەی دەرمانی: حەب و شەربەت.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D.
- بەکارهێنان لە شیردان: لەماوەی چارەسەریدا شیردان دەبێ ڕابگیرێ.

*بەکارهێنان: جۆرەکانی گرژی، چارەسەری ڕێگرتن لە ژانەسەرەکانی شەقەسەر (میگەرین)، ناهاوسەنگییەکانی پەشێوی، چارەسەری ژانەکانی عەسەبی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ۲۰ تا ۳۰ ملگم بۆ هەر کیلۆگرام کێشی لەش.

*بەکارنەهێنان: ناهاوسەنگی جگەر.

- زیانە لاوەکییەکان: هێڵنج، سکچوون، دڵ پێچە، ژانە سک، بێ ئۆقرەیی، هەڵوەرینی موو، ئاوسانی مەمکەکان، خوێن بەربوون، کەمبوونی بیستن، لەرزین، ناهاوسەنگییەکانی بینین، کەمبوونی ژمارەی پلاکتەکان، زیادبوونی ئەنزیمەکانی جگەر، ترپەی دڵ.

فێرکردنی نەخۆش:

- باشتروایە دەرمانەکە لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.
- ئاگادارکردنی پزیشک لە: ناهاوسەنگی بینایی، سکچوون، ژانی سک، پاشەڕۆی بێ ڕەنگ یان کەم ڕەنگ، زەردی، ڕشانەوە.
- خۆپاراستن لە بەکارنەهێنانی دەرمان لەناکاو.

## والسارتان VALSARTAN

● ناوی بازرگانی: Diovan

● گرووپــی دەرمــانی: دژی پەســتانی خوێن.

● شـێوەی دەرمــانی: حەبــەکانی ٨٠ و ١٦٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی D.

بــەکارهێنان لــە شــیردان: بــەکارهێنانی قەدەغەیە.

بەکارهێنان: چارەسەری پەستانی خوێنی بەرز.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: ٨٠ تــا ١٦٠ ملگــم ڕۆژانە.

*بەکارنــەهێنان: هەســتیاری بــەخۆی، سکپڕیو شیردان.

● زیانــە لاوەکییــەکان: سەرئێشـــە، سەرســـووڕان، هێڵــنج، سکچـــوون، سینوزیت، کۆکە.

فێرکردنی نەخۆش:

- ئاگــادارکردنی پزیشــك لــە کــاتی ســەرهەڵدانی تــا، ئاوســانی دەســتو پێیــەکان، ترپــەکانی نــاڕێکی دڵ، ژانــی سینگ.

- لــەو کاتــەی کــە ژەمــی دەرمانتــان لــەبیرکرد لــەکاتی بیرهاتنــەوە بــەکاری بهێنن. مەگەر لەوکاتەی کە یەك کاتـژمێر بۆ ژەمی تر مابێت.

## وراپامیل VERAPAMIL

● ناوی بازرگانی: Isoptin

● گرووپــی دەرمــانی: دژی پەســتانی خوێن، دژی ئانژین.

● شێوەی دەرمـانی: حەبـەکانی ٤٠و ٨٠ ملگم.

● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بــەکارهێنان لــە شــیردان: لــەماوەی چارەسەریدا شیردان دەبێ ڕابگیرێ.

بــەکارهێنان: چارەســەری ئانــژین، چارەسەری دژی پەستانی خوێن.

ڕێــژەی بــەکارهێنان: بــەپێی ویســتی پزیشك.

# W

وارفارین سۆدیۆم

WARFARIN SODIUM

- ناوی بازرگانی: Coumadin
- گرووپی دەرمانی: دژی مەیین.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢.٥و ٥ ملگم.
- بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی X.

*بەکارهێنان لە شیردان: سوودەکانی دەرمان لە بەرامبەر زیانەکانی دا هەڵسەنگێنرێت.

بەکارهێنان: ڕێگرتن لە مەیینی خوێن لە خوێنهێنەر و قۆڵەکان. پاش لەپرووەستانی دڵ، خاوبوونەوەی ماسوولکەی دڵ، نەخۆشی دڵی ڕۆماتیزمی، وشك بوونەوەی درێژخایەنی سکۆڵەکان.

*بەکارنەهێنان: ناڕێکی گیرانی دڵ، کەمبوونی ژمارەی ترپەکانی دڵ، دابەزینی پەستانی خوێن، شیردان.

- زیانە لاوەکییەکان: ئاوسان، ناڕێکی گیرانی دڵ، سەرسووڕان، سەرئێشە، ژانی سك، هێڵنج، لاوازی.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەمەبەستی ڕێگرتن لە سەرهەڵدانی قەبزی، بەکارهێنانی شلەمەنیو کەرەستەی فیبری زیادبکەن.
- ئاگادارکردنی پزیشك لەکاتی تەنگەنەفەسی.
- دەرمانەکە لەگەڵ خواردن بەکاربهێنرێت.

ڕێژەی بەکارهێنان: ١ تا ٢ حەب یەك جار لەڕۆژ لەژێر چاودێری پزیشك.

*بەکارنەهێنان: خوێن بەربوونی توند، ئافرەتانی سکپڕ، نارێکی گورچیلەو جگەر، پەستانی خوێنی بەرز، نەشتەرگەریەکانی چاو و دەماغ، ناهاوسەنگییەکانی خوێنی بەربوون دەر.

● زیانە لاوەکییەکان: تا، ژانی سك، هێڵنج، پاشەڕۆی قیراوی، زەردی، خوێن بەربوون لە هەرشوێن لە لەش دەکرێ روویدات.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەمەبەستی ڕێگرتن لە خوێن بەربوونی پوو لە سیواکی نەرم سوود وەربگرن.

- لە جیاتی مووس لە ریش تاشی کارەبایی سوود وەربگرن.

- ئاگادارکردنی پزیشك لە هەر چەشنە خوێن بەربوون.

- خۆپاراستن لە ئەنجامدانی چالاکییەکانی مەترسیدار (تۆپی پێ، خلیسکانێ، کاراتە).

- لەکاتی سەردانی پزیشك پزیشك ئاگاداربکەن کە (وارفاری) بەکاردەهێنن.

- سنووردارکردنی ئەو خواردەمەنیانەی کە پڕن لە ڤیتامین K (ئەو سەوزانەی کە گەڵای سەوزیان هەیە).

- خۆپاراستن لەبەکارهێنانی خۆرسەرانەی دەرمانەکانی تر.

فێرکردنی نەخۆش:

- بەرزبوونی پەستانی خوێن، ڕاستبوونەوەی مووەکان، ترپەی دڵ لە هێماکانی ژارانگەزی دەرمانەکەن‌و دەبێ پزیشکی لێ ئاگاداربکرێ.



## YOHIMBINE یوهیمبین

- گرووپی دەرمانی: بلۆك کەری کەناڵەکانی ئالفا.
- شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٢ ملگم.

*بەکارهێنان: چارەسەری ناتوانایی سێکسی.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٢ تا ٤ ملگم ڕۆژانە.

*بەکارنەهێنان: هەستیاری بەخۆی، ناهاوسەنگییەکانی کارکردنی جگەر یان گورچیلە، بەساڵاچووان.

- زیانە لاوەکییەکان: بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، لەرزینی دەست، تووڕەبوون.

*پارێزگارییەکان: لەگەڵ دژی خەمۆکیەکان تەداخولی کاریگەری هەیە.

- دەبێ ٢ مانگ دەرمان بەکاربهێنرێت تا کاریگەریەکەی بە دەربکەوێ.
- ئاگادارکردنی پزیشک لە هێڵنج، سکچوون، ڕشانەوەی توند، بێ ئۆقرەیی، ژانی سك.
- لە کاتی سوود وەرگرتن لە تتراسایکلین و پێکهاتەکانی دەبێ ٢ کاتژمێر لەنێوان ئەم دوو دەرمانە مەودا هەبێت.



## ZINC SULFATE سۆلفات زوی

● ناوی بازرگانی: Zincate
● گرووپی دەرمانی: تەواوکەری خواردەمەنی.
● شێوەی دەرمانی: کەپسوول و شەربەت.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی A.
● بەکارهێنان لە شیردان: ڕێپێدراوە.

بەکارهێنان: چارەسەری کەمبوونی زوی، چارەسەری یارمەتیدەری نەخۆشی ویلسون.

*بەکارنەهێنان: بەکارنەهێنانی لە رادەبەدەر زیانی هەیە.

● زیانە لاوەکییەکان: ژانی سك، سکچوون، هێڵنج.

فێرکردنی نەخۆش:

## ZOLPIDEM زۆلپیدم

● گرووپی دەرمانی: خەوهێنەر.
● شێوەی دەرمانی: حەبەکانی ٥و ١٠ ملگم.
● بەکارهێنان لە سکپڕیدا: گرووپی C.

بەکارهێنان لە شیردان: بەکارهێنانی قەدەغەیە.

بەکارهێنان: کۆنترۆڵی بێ خەوی بۆ ماوەیەکی کورت.

ڕێژەی بەکارهێنان: ٥ تا ١٠ ملگم بەر لەخەو.

*بەکارنەهێنان: نیەتی.

- زیانـــە لاوەکییـــەکان: ڕۆیایـــەکانی ناسروشتی ـ خەواڵوویی لە ماوەی ڕۆژدا، خـــەمۆکی، سەرئێشـــە، ژانـــی قەفەســـەی ســـینگ، ســـینوزێت، ژانـــی ســـك، قـــەبزی، سکچـــوون، وشـــکی دەم، هێڵـــنج، ژانـــی جومگە.

فێرکردنی نەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی درێژخایەنی دەرمانەکە.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.
- لەکاتی بەکارهێنانی دەرمان بە گـەدەی بەتاڵ دەرمانەکە خێراتر هەڵدەمژرێ.

- زیانـــە لاوەکییـــەکان: ڕۆیایـــەکانی ناسروشتی ـ خەواڵوویی لە ماوەی ڕۆژدا، خـــەمۆکی، سەرئێشـــە، ژانـــی قەفەســـەی ســـینگ، ســـینوزێت، ژانـــی ســـك، قـــەبزی، سکچـــوون، وشـــکی دەم، هێڵـــنج، ژانـــی جومگە.

فێرکردنـــــــــــــی نـــــــــــــەخۆش:

- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی درێژخایەنی دەرمانەکە.
- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی ئەلکهول.
- لەکاتی بەکارهێنانی دەرمان بە گـەدەی بەتاڵ دەرمانەکە خێراتر هەڵدەمژرێ.